## ڕاڤە و لێکدانەوەی

# چوار بنچینەکە

## بە کوردی


وتـاری: م. اسـماعیل سـوسـەیی

نـوسـیـنـەوەی: ئـەنـدازیار عـبـداللە

# پێشەکی

بسم الله الرحمان الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا، ومن سيئات أعمالنا، مَن يهده الله فلا مضلَّ له، ومن يُضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أنَّ محمداً عبده ورسوله.

[يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ] (آل عمران آية : ١٠٢)

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە , لە خوا بترسن و پارێزکاربن ,بە شێوەیەکی وا کە شایستەی ئەو زاتەیە ,هەمیشە و بەردەوام پابەند و دامەزراوبن لەسەر ئیسلامەتی , هەوڵ بدەن بۆ ئەوەی هەر کاتێك مردن لەسەر ئیمان و ئیسلامەتی نەبێت نەمرن .

أما بعد؛ فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هديُ محمد – صلى الله عليه وسلم –، وشرَّ الأمور محدثاتها، وكلّ محدثة بدعة، وكلَّ بدعة ضلالة، وكلَّ ضلالة في النار

ئەم نامیلکەیەی لەبەردەستتە بریتیە لە شەرح و لێکدانەوەی نامیلکەی (القواعد الاربع) چوار بنەماکەی (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله) ،کەلەلایەن بەڕێز مامۆستا (باوکی یەحیا)ەوە (خوای گەورە بیپارێزێ) شەرح کراوە ، جا بەهۆی گرینگی بابەتەکە ئێمەش هەڵساین بە نووسینەوەی , بە ئومێدی ئەوەی سوودێکی هەبێ بۆ خۆمان و پاشان بۆ مسوڵمانانیش بە گشتی, شەرحی ئەم نامیلکەیە بەدەنگ تۆمار کراوە کە پێکهاتووە لە پێشەکیەك و دوانزدە وانە، جا ئێمە بەگشتی هەموو وتارە دەنگیەکانمان وەکو خۆی نووسیوەتەوە تەنها چەند ڕێککاریەك کراوە لە پاش و پێشی هەندێ لە وشەکان تاکو ئاسنتر بێت بۆ تێگەیشتن ، جا کە نامیلکەکە خۆی بەناوی چوار بنەمایە ئێمەش مەتنی هەر بنەمایەکمان بە جیا لە پێش شەرحەکە داناوە ئینجا دووبارە بەش بەشی مەتنەکەمان داناوەتەوە لەگەڵ شەرحەکەی ، وە داوا لە خوای پەروەردگار دەکەین پاداشتی بەخێری

مامۆستا بداتەوە بۆ ئەم کارەی ، وە داوا لە خوای پەروەردگار دەکەین  کە لە ئێمەش  قەبوڵ بکات و بیکاتە توێشوەك بۆ دوارۆژمان .

وصلَّ اللهُ وَسَلَّمَ عَلَىَ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَىَ آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين

2017/11/5 میلادی

16 صفر 1439 هجری

ئەندازیار عبدالله



بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

## پێشەكی

الحمد لله رب العالمين وصلّ الله وسلم وبارك على نبينا محمد وعلى آله وصحبه اجمعين ، اللهم طهّر قلوبنا من الشبهات والشهوات وأعمالنا من الرياء يارب العالمين .

خوایە بۆ خاتری ناوە جوانەكانت و سیفەتە بەرزەكانت بۆ خاتری ئیسمی ئەعزەمت پاداشتی ئەو زانایانەت دابێتەوە كە لە پێش ئێمە هاتوونەو ئەهلی سوننە و جەماعەبوون وئەوانەی وەفاتیان كردووە لێیان خۆشبوبی لە گوناهو تاوانەكانیان, پلەت بەرز كردبنەوە ئەوانەی ماون جێگیریان بكەی یارب العالمین لەسەر بیروباوەڕێك كە خۆت پێی ڕازی كە هی پێغەمبەر(ﷺ)بووە هاوەڵە بەڕێزەكان لەسەری ڕۆیشتوون, وە ئێمەش وا لێبكەی لەسەر ئەو ڕێگەیە بڕۆین بەردەوام بین لەسەر ئەو بابەتە عەقیدەو بیروبڕوایەی, بەتایبەت (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله)پاداشتی بدەیتەوە لەسەر ئەو هەمووە ناخۆشییە و زەحمەتییەی بینی لە پێناو بڵاوكردنەوەی عەقیدەو بیروبڕوای ئەهلی سوننەو جەماعە لەسەردەمی خۆی و نەهێشتنی بیدعەو كەم و كورتی وشیركیات كە زۆر بوو لەسەردەمی ئەو.

دەمانەوێ بە پشتیوانی خوای گەورە لە زنجیرەیەكدا پەرتووك و نامیلكەكانی (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله)ئەوانەی كە پێمان وایە زۆر گرنگ و پێویستە بۆ ئەو سەردەمەی قوتابیان سوودی لێوەربگرن و بڕواداران و مسوڵمانان تەواو لێی تێبگەن شەرح و ڕاڤەیان بكەین, جا ناوی لێدەنێین زنجیرەی (بیروبڕوا لە دیدگای قورئان وفەرموودە) كەهەر لەنامیلكەكان كە ڕاڤەیان دەكەین ناوی تایبەتی خۆی بۆ دەینین بۆ نموونە ئەم جارە دەمانەوێ شەرح و ڕاڤەی نامیلكەی (القواعد الاربع) چوار بنەماكەی (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب)(رحمه الله) كە نووسیویەتی كە چوار بنەماكە ڕاڤە دەكەین بەوەی كە دەیكەینە كوردی ئەوجا هەڵوەستەی لەسەر دەكەین ئەو شوێنانەی كە هەڵوەستەی پێویست بێ پاشان پرسیارو وەڵام لەسەری دادەنێین كە(القواعد الاربع) بریتیە لە پێشەكیەكی زۆر بە پیتو بەرەكەت پاشان چوار بنەماكە كە سەرەتا باسی شیرك و هاوبەشی و هۆكارەكان دەكات و لەكۆتاییەكەش بنەمایەكانی كۆتایی بەتایبەت بنەمای چوارەم باسی نەتیجەو دەرەئەنجامی ئەو شیرك و هاوبەشیانە دەكات

كەچيان بەسەر هاتيەو سەردەمی ئێمە لەگەڵ سەردەمی پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)چۆنە, جا ئايەت و بەڵگەكان دەهێنينەوە لە ڕوانگەی ئەهلی سوننەو جەماعە و ڕايە پەسەندەكانی ئەوان, بە پشتيوانی خوای گەورە بۆتان ڕوون دەكەينەوە.

جا لەو پێشەكيەی دەمانەوێ بەكورتی (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب) تان پێ بناسێنين, (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب)كێبووە،(شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب)(رحمه الله) ئەو پياوە بەرزو بەڕەێزەبووە كە ناوی (أبوالحسين) بووە كە كونيەكەی بووە،وە ناوی خۆی (محمدی كوڕی عبدالوهاب كوڕی سولەيمانی كوڕی عەلی كوڕی محمدی كوڕی ئەحمەدی كوڕی ڕاشيدی وهيبی تەميمی بووە ), وە نسبەتەكەی بۆ قەبيلەی تەميم بەناوبانگە كە قەبيلەی تەميم بەناوبانگە ناوی هاتيە. كە لە پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە لەصحيحی بوخاری و مسليم لە بوخاری بەژمارە(٢٤٠٥) وە لە مسليم بە ژمارەی (٢٥٢٥) ئەبو هوريرە (رضي الله عنه)گێڕايتيەوە دەفەرمووێ ((أَنَّهُ قَالَ لَا أَزَالُ أُحبُّ بَني تَميمَ منْ ثَلاث سَمعْتُهُنَّ منْ رَسول الله (ﷺ) سَمعْتُ رَسُولَ الله يَقُولُ هُمْ أَشَدُّ أُمَّتي عَلَىَ الدَّجَّال قَالَ وَجَائَتْ صَدَقَاتُهُمْ فقَالَ النَّبيُّ (ﷺ) هذه صَدَقَاتُ قَوْمنَا، وَكَانَتْ سَبيَّةٌ منْهُمْ عنْدَ عَائشَةَ (رضي الله عنها)فَقَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) أَعْتقيْهَا فَإنَّهَا منْ وَلَد إسْمَاعيل))واتە:(ئەبو هورەيرە دەفەرمووێ من بەردەوام تا ئێستاش بەنو تەميمم خۆشدەوێ لەبەر سێ شتان گوێبيستی پێغەمبەر (ﷺ)بوومە فەرمووی بەنو تەميم لەهەموو تيرەو خەڵكەكانی تر توندو تيژترن بەسەر دەجال، وە زەكات و خێرو سەدەقەشيان هات فەرمووی ئەوە صەدەقات و خێرو چاكەی قەومەكەی خۆمە كە بەنو تەميمی مەبەست بوو ،جا دەڵێ جاريەكی بچووكيش لای دايكە عائيشە (رضي الله عنها) بووپێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی ئازادی بكە ئەو كۆيلەيەی كە لەلاتە لەنەوەی ئيسماعيل پێغەمبەرە(ﷺ).

جا ئەو بەنو تەميمە كە (شێخ محمد) يش لەو بەنو تەميمەيە كە پێغەمبەر(ﷺ)وای لەسەر فەرمووە كە ئەبو هورەيرە (رضي الله عنه)دەڵێ منيش لەبەر ئەو سێ خاڵە خۆشم دەوێن (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب)(رحمه الله) لەساڵی (١١١٥)ی كۆچی لەدايك بووە لە (عويەينە) ی كە شوێنێكە نزيك شاری (ڕياز)ی ئێستای سعوديە,(شێخ عبدالوهاب) ی باوكی زاناو شەرع زان بووە وە قازی بووە وە لەسەرەتادا كوڕەكەی خۆی ( محمدی كوڕی عبدالوهاب) ی داناوە كە قورئانی پێ لەبەر كردووە پێش ئەوەی تەمەنی بگاتە (دە) ساڵی هەموو قورئانی تەواو

کردووە.وە(فقه الحنبلی) لەخزمەتی باوکی خوێندووە وە تەفسیرو فەرموودەو عەقیدەی خوێندووە لەپاشان دڵی چۆتە سەر پەرتوکەکانی (شیخ الإسلام ابن تیمیه)و(ابن القیم الجوزی) خوێندووەو لەبەری کردووە وە زۆر پێیانەوە سەرسام بووە, لەپاشان حەجی ماڵی خوای گەورەی کردووەو لەشاری مەککە و مەدینە بەخزمەتی زانایانی سەردەمی خۆی دەگات لەوانە (عبداللە ی کوری ئیبراهیم آل سیف) وة (شیخ المحدث محمد حیات سندي)پێیان دەگات و سوودی زۆریان لێدەبینێ, بۆ خوێندن و زانست بەدەستهێنان هاتۆتە وڵاتی (عێراق) یش وە سوودی زۆری لە (بەسڕە) کردووە لەلای(شیخ محمد مجموعی) لەسەردەمی خۆی, وە دوایی ویستی بچێتە (شام) یش بەڵام بۆی ئاسان نەبووەو ویستەکەی نەهاتۆتە جێ کە بچێتە (شام) زانست بەدەست بێنێ.

(شیخ محمد بن عبدالوهاب) (رحمه الله) لێی دەگێڕنەوە کەسێکی ژیر و ئاقڵ بووە زۆر پێداگری کردووە لەسەر بەدەستهێنانی زانست, وە زۆر ئارام گربووە لەسەر دەعوەو بانگەوازەکەی, وە کەسێکی بەڕاستی ئازابووە لەگوتنی حەق و ڕاستی و ڕەتکردنەوە و پوچەڵکردنەوەی شیرك وهاوبەشی و خراپە لەسەردەمی خۆیدا ئەوەی بیدعە و خورافیات بوو هەمووی خستە ڕوو و دژیان وەستا بەبێ ئەوەی دوودڵی لێبکات. هەر لەسەرەتای چووە شاری (بەسڕە) بۆ بەدەست هێنانی زانست لەوکاتەدا بینی خەڵکانێك گۆڕ دەپەرستن کە ئەوە شیرك و هاوبەشییە لێیان بەوەڵام هاتووە ئەو کاتە ئازاری زۆری پێگەیشت بەدەستی(الرافضة)و شیعەکان کە ئەوان گۆڕیان دەپەرست کە شیرکیان ئەنجام دەدا, بەتایبەتی لە شاری (بەسڕا) وە (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله) ئارامی گرت و گوێی پێنەدا لەپێناو خوای گەورە بەردەوام بوو.

لەپاشان (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله)دەگاتە (عوسمانی کوڕی موعەممەڕ) کە ئەوکات ئەو بەرپرس بووە لەسەر خەڵکی (عویەینە), داوای لێکردووە بۆچی شەریعەتی ئیسلام پەیڕەو ناکەی وە کارو ئیشی پێناکەی, وە خوای بەیەك بگری و شیرك وهاوبەشی و بیدعە بۆخۆت مەیکەو مەشهێڵە بکرێت ئەوکاتە خوایگەورە سەرت دەخات و پشتگیریت دەکات.چونکە خوای پەروەردگار یارمەتی دەرە بۆ کەسی بڕوادارو بۆ کەسێك کە ئەو کارەی ئەنجام بدات ،جا ئەو کارو ئیشەی (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله)کەئەوەی داواکرد لە (عوسمانی

کوڕی موعەممەڕ) ئەو هەواڵە بڵاوبووەوە تاوەکو وای لێهات ئەو هەواڵە گەیشتە حاکمی ئەو سەردەمی شوێنی (ئەحسا) کە ناوی (سولەیمانی کوڕی محمدی کوڕی عورەیڕ) بووە ئەویش لە(بەنی خالید) بووە ئەویش بۆ (إبن معمر عوسمانی) نووسی کە ئەویش ئەمیری (عویەینە) بووە, ووتی فەرمانت پێدەکەم ( محمدی کوڕی عبدالوهاب) بکوژە جا ئەو نامەیە کە گەیشت بە (عوسمان) کەبینی فەرمانی کوشتنی (محمدی کوڕی عبدالوهاب) ی پێکراوە .جا هەواڵ گەیشتە (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله)ئەو کاتە (عوسمان) ترسا لە حاکمی (ئەحساو) ووتی ناتوانم چیدی بەرگریت لێبکەم ئەگەر سەرپێچی ئەو بکەم ڕەنگە ئەوەی دەمداتێ ساڵانە لێم ببڕێت وە شەڕمان تووش دەبێ, ئەوەبوو پەنا بە خوا لەسەر وەعدی خۆی نەبوو پشتی (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله)ی بەردا نەیپاراست ووتی من ناتوانم بتپارێزم لەدەستی ئەو.

ئەوە بوو (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله)دەچێتە (درعییە) ی کە ئەو کاتەی (محمدی کوڕی سعود) ئەمیری (درعییە) ی بوو.لەوێ دەمێنێتەوە لەلای یەکێك لە قوتابییەکانی کەناوی (عەلی کوڕی عبدالرحمن سویلیم) بووە ئەویش ڕێزی لێدەگرێت بەنو سویلیم دێن و لێی کۆدەبنەوە قسەیان لەگەڵ دەکات تاوەکو هەواڵەکە دەگاتە (محمدی کوڕی سعود)ئەویش دێت و لەگەڵ (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله)یەکتر دەبینن (شێخ محمد) داوای لێدەکات کە حوکمی ئیسلام پەیڕەو بکات تاوەکو ببنە ئەهلی تەوحید, وە وای لێدێت کە لە کۆتاییەکەی لە ساڵی (١١٥٨) ی کۆچی بۆ یەکەمجار حوکمی دەوڵەتی شەرعی دامەزرا لەو شوێنە, وە (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) بووە هۆکار بۆ نەهێشتنی ئەو بیدعە و کەم و کوڕیانەو نەهێشتنی شیرك و هاوبەشیانە لەوێ نەمێنیت .خوای گەورە سەرکەوتووی کردن وە جەنگ و جیهادیان کرد لە پێناو بڵاوکردنەوەی خوا بەیەککگرتن ونەهێشتنی شیرك و هاوبەشی ئەوەبوو (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله) لەکۆتایی ساڵی (١٢٠٦) ی کۆچی لەتەمەنی (٩١) ساڵی کۆچی دوایی کرد گەڕایەوە لای خوای گەورە, بەڵام دڵی بەوە داکەت خوای گەورە پاداشتی بداتەوە شیرك وهاوبەشی نەهێشت.

وە پەرتووكی زۆری هەیە لەوانە (كتاب التوحيد- ثلاثة الاصول-كشف الشبهات -والمسائل الجاهلية-مختصر سيرة النبي(ﷺ)-مختصر زاد المعاد -الاصول الستة-مجموع الحديث علي الابواب الفقة-القواعد الاربع -الواجبات المتحتمات -) زۆرێك لەناميلكەو نووسراوی تر, وە نامەی گۆڕینەوە كە سوودو كەڵكێكی زۆريان تێدايە ئەوەی بەوردييەوە بيخوێنێتەوە دەزانێ (شێخ محمد) پابەند بووە بە پەيڕەوی ئەهلی سوننەو جەماعە لەسەر ڕێبازەكەی زاناياني پێش خۆی وەكو( ابن تيميه-وابن قيم الجوزی -وئيمامی ئەحمەد) وە پێشينانی چاك (شافيعی و ماك) و هەتا دەگاتە پێغەمبەر(ﷺ).لە عەقيدەو بيرو بڕوا وابووەلۆمەی لۆمەكاران كاری تێنەكردووە. خوا پاداشتی دابێتەوە بەو پەڕی پاداشت وە پلەی بەرز كردبێتەوە لەبەهەشتەكان.

## وانەی یەکەم

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ
أَسْأَلُ اللهَ الْكَرِيمِ رَبَّ الْعَرْشَ الْعَظِيمِ أَنْ يَتوَلَّاكَ فِي الدُّنْيا وَالْآخرَة، وأَنْ يَجْعَلَكَ مُباركاً أَيْنَما كُنْتَ، وأَنْ يَجْعَلَكَ مِمَّنْ إذا أُعْطِيَ شكَر، وَإِذا ابْتُلِيَ صَبَر، وَإِذا أَذْنَبَ اسْتَغْفَر، فَإِنَّ هَؤُلاءِ الثَّلاث عِنْوانُ السَّعَادَة.

لەشەرح و ڕاڤەی نامیلکەی (القواعد الاربع) چوار بنەماکەی (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب)(رحمه الله)لەوانەی یەکەم لەسەرەتاوە دەست پێدەکەین لە ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) بە ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ نامیلکەکەی دەست پێکردوە وەك شوێنکەوتەبوونی قورئانی پیرۆز کەسەرەتای قورئان بە ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ دەست پێکراوە,لەپاشان وەك شوێنکەوتەبوونی پێغەمبەری دڵسۆز (ﷺ)کە لەهەموو نامەکانی سەرەتا بە ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ دەستی پێکردووە, جا ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ زۆر بەکورتی و پوختی مانای ئەوە دەگەیەنێ کەداوای کۆمەکی و یارمەتی دەکەین لە ﴿الله﴾ لەو ئیش و کارەی کەدەیکەی و﴿بسم الله﴾ ی بۆ دەخوێنی بۆ نموونە ئەگەر خوێندنەوەیە (فعل) وکاری خوێندنەوەی بۆ ئەندازەکەی واتا داوای کۆمەکی ویارمەتی لە ﴿الله﴾ دەکەم بۆ خوێندنەوەکەم یان بۆ دەرس و وانە وتنەوەکەم یان بۆ ڕۆیشتنم یان بۆ دانیشتنم بۆ هەر کار و ئیشێکی کە مەبەستە﴿بسم الله﴾ ی لێ دەکەی, ئەوە ڕای پەسندی زانایانی زمانەوانیە وە ڕای زانایانی نحو و بەلاغەیە.

جا لەپاشان ﴿بسم الله﴾ بەناوی ﴿الله﴾,﴿الله﴾ ئەعرەف ولمەعاریفە وەك (سیبەوەیهی) فەرموویەتی لەهەموو ناوان ناسراوترو زانراوترە وە (معلوم) ترە بۆ خەڵکەکەی, وە ناوی کۆکەرەوەی هەموو ناوە زۆر جوانەکانی خوای گەورەیە هەمووی لە خۆ دەگرێت و هەموو سیفەتە بەرزەکانی خوای گەورەیە, کە ﴿الله﴾ بەمانای پەرستراوی شایستەی پەرستنی ڕاستەقینە دێت ﴿الرحمن﴾ یش هەر ناوی خوای گەورەیە لەسەر وەزنی (فعلان) ـە کە (سیغەی موبالەغە) یە واتا ڕەحمێکی فراوان هەموو شتێکی لەخۆ بگرێ ﴿الرحيم﴾ یش هەر ناوی خوای

گەورەیە لەسەر وەزنی (فعیل) بە مانای (فاعل) ـە واتا خوا خاوەن ڕەحم و بەزەییەکە دەتوانێ بیکاتە( فعل) کار بیگەیەنێت بەهەر کەس و شتێکی لەهەر کات و شوێنێکی.

کەواتە کورتەی قسان ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ واتا داوای یارمەتی و کۆمەکی لە ﴿الله﴾ لەو ئیش وکارەی کە دەیکەین, بۆ نموونە هی من وانە وتنەوەیە لە وانە وتنەوەکەمدا ئەو ﴿الله﴾ یە یارمەتی و کۆمەکیم بکات ئەو ﴿الله﴾ یەی کە﴿الرحمن﴾ ـەخاوەن ڕەحم وبەزەییەکی فراوانە هەموو شتێکی لەخۆ دەگرێت ﴿الرحيم﴾ یش ئەو ڕەحمەشی دەتوانێ بیگەیەنی بە هەرکەس و شتێکی لەهەر کات وشوێنێکی.

جا (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله) پێشەکیەکەی لە (الوابل الصيب) ی پێشەوا (ابن قيم) (رحمه الله)وەرگرتووە کە وەکو وی دەڵێ ﴿أسأل الله الكريم رب العرش العظيم أن يتولاك في الدنيا والآخرة﴾ داوا دەکەم لە ﴿الله﴾ ی (کریم)ی بەرزو بەڕێزو مەزنی بەخشەر کە خاوەنی بارەگای مەزنە ئیش و کارەکانی دونیاو دواڕۆژت پشتگیری بکات و بۆت ئاسان بکات,﴿وأن يجعلك مباركا أينما كنت﴾وە تۆ بکاتە خاوەن پیت و بەرەکەت و خاوەن چاکەو باشە لە هەر شوێنێکی هەی,﴿وأن يجعلك ممن إذا أعطى شكر﴾ وە وات لێبکات لەوانەبی کە پێت بەخشرا سوپاس گوزاری لەسەر بکەی بەرامبەر بەخشینەکان,﴿وإذا ابتلي صبر﴾وە ئەگەر تاقیکرایەوە لەبەرامبەر تاقیکردنەوەکە ئارامبگری,﴿وإذا أذنب استغفر﴾ ئەگەر تاوان وگوناهێکت لێ ڕویدا داوای لێخۆش بوون و داپۆشینی بکەی لە خوای گەورە بگەڕێیەوە و تەوبە بکەی,﴿فإن هؤلاءالثلاث عنوان السعادة﴾ جا ئەو سیانە ئەگەر پێت بەخشرا سوپاسگوزاری لەسەر بکەی و ئەگەر تاقیکرایەوە ئارامتگرت و ئەگەر گوناهت کرد تەوبەو داوای لێخۆشبونت کرد لە خوای گەورە ئەوانە ناونیشانی بەختەوەرین بۆ مرۆڤەکان.

جا دێینەوە سەر هەریەك لەو خاڵانە هەڵوەستەیان لەسەر دەکەین یەکەمیان کە دەڵێ﴿رب العرش العظيم﴾ عەرش و بارەگای خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزو لەفەرموودەی پێغەمبەری دڵسۆز (ﷺ)وەسفی کراوە بەچەند وەسفێك جار وایە بە (عظیم) واتە گەورە بارەگەی گەورە و مەزن, وەجاریش هەیە بە (کریم) واتە بەڕێز و سەنگین, جاریش هەیە لەسەر یەکێ لە

قیرائەتەکان کە دەخوێندرێتەوە لە سوڕەتی (البروج) بەکەسرەی ژێر (المجید) لەئایەتی(ذو العرش المجید) ئەو کاتیش وا وەسف کراوە.

جا لە پاشان (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله) دەفەرمووێ ﴿أن یتولاك﴾ هەڵوێستەی لەسەر دەکەین خودای پەروەردگار پشتگیریت بکات ئەو پشتگیریە دوو جۆرە پشگیریەکی گشتی کە هەموو مرۆڤ و کەسەکان خوای گەورە دەیکات, بە بڕواداران بەگشتی وە پشتگیری تایبەتیش کە هی پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام)ئەوانەی زۆر لەخوا ترسن و دۆستی خوانەو لە خوا نزیکن پشتگیری تایبەتی کردوونە و دەیکات خوای گەورە لە دونیاو دوارۆژ,وە وشەی ﴿مبارکا﴾ دەشێ و دەگونجێ بۆ مرۆڤەکان وبەدیهێنراوەکان بگوترێ بەڵام وشەی (تبارك)ەن لەسەر ڕای پەسەندی ئەهلی سوننە و جەماعە تەنها بۆ خوای گەورە دەوترێ و تایبەتە بەو لەبەر ئەوەی چونکە (تبارك) ـە ئەوەی لێوەردەگیرێ واتە خوای گەورە پیت و بەرەکەت دەڕێژێ بەسەر هەر کەس و شتێکی, هیچ کەسی تر ئەوەی لەتوانادا نییە پیت وبەرەکەتەکەی ببەخشێ, جا ﴿مبارکا﴾ واتە ئەوەی خاوەن پیت و بەرەکەتە پێی بەخشراوە ئەوا مرۆڤیش دەشێ و دەگونجێ لەلای خوای گەورە پیت وبەرەکەتی پێ بەخشرابێ وە ئەو دوعایە کە ئەو زانایە بەڕێزە دەیکا بۆ کەسانێ کە ئەو نامیلکەیە دەخوێننەوە, دەزانێ دوعای لەجێیە نیشانەی دڵسۆزییە خوایگەورە پاداشتی دابێتەوە.

لەپاشان وشەی ﴿شکر﴾ ئەگەر بێینە سەری وەك (ابن القیم) (رحمه الله) هەر لە کتێبە نایابەکەی لە (الوابل الصیب) لەوێدا بەڕاستی جوان دەفەرمووێ ﴿شکر﴾ بزانین بەچی بەدەست دێت﴿شکر﴾ بەوەی بەدەست دێت لەسەر سێ ڕوکن وەستاوە, یەکەم تۆ دان بنێی بەو نازو نیعمەتەی کە خوا پێی داوی لە ناخی دڵتەوە وە پاشان بە زمان بیڵێیتەوە کە خودا چ نازو نیعمەتێکی پێ بەخشیوی وە پاشان بەکاری بهێنیت لە پێناو ڕەزامەندی خوای پەروەردگار کە ئەو بەتۆی بەخشیوە, جا ئەوەی وا بکات و ئەو سێ ڕوکنەی بهێنێتە جێ لەبەرامبەر نازو نیعمەتەکان, ئەوە شوکرانە بژێری خوای پەروەردگاری کردووە جا ﴿صبر﴾ و ئارامیش لەبەرامبەر تاقیکردنەوەکان کە مرۆڤەکان تاقیدەکرێنەوە ئەویش بەوەی دەبێت کە (ابن القیم)(رحمه الله) دەفەرموێ کەسەکە نەفسی خۆی بگرێ لەوەی کە بەسەری دێ پێی ڕازی بێ و لێی توورە نەبێ و پێی دڵتەنگ نەبێ وە زمانی بگرێ لەسەر سکاڵاکردن لەسەر ئەو ناخۆشی

و تاقیکردنەوانەی خوای گەورە, وە ئەندامەکانی بگرێ له گوناه و تاوان بەوەی کەوا لەخۆی نەدا و پۆشاکی خۆی نەدڕێنێ ومووی قژیان دەرنەهێنن وەك ئافرەتان لەکاتی ناخۆشیدا دەیکەن لەبەرامبەر ئەو تاقیکردنەوانەی کەبەسەریان دێ کەسێکیان لێ دەمرێ, جا لەپاشان ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێ هەموو مرۆڤەکان جگه له پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)ئەگەری ئەوەی هەیه توشی گوناه و تاوان بن, بەلاّم ئەگەر توشی گوناه و تاوان بوون و داوای لێخۆشبونیان کردووه و تەوبەیان کردووه ئا ئەو کاتی پلەیان بەرز دەبێتەوه, چونکه قسەیەکی زۆر جوان هەیه هی پێشینانی چاك هەر وەکو (ابن القیم) (رحمه الله)له کتێبەکەی (الوابل الصیب) گێڕایتیەوه دەڵێ هەندێ لەسەلەف گوتوویانه (إِنَّ الْعبدَ لَيَعْمَلُ الذَّنْبَ يَدْخُلُ بِهِ الْجَنَّةَ ويَعْمَلُ الْحَسَنَةَ يَدْخُلُ بِهَا النَّار), جا بەدرێژی لەپەرتوکەکەی باسی دەکات دەڵێ هەندێ له پێشینانی چاك فەرموویانه بەندە کارو کردەوەیەکی دەکات که گوناه و تاوانه ئەنجامی دەدات پێیوه دەچێته بەهەشت وە چاکەیەکیش دەکات پێی دەچێته دۆزەخ. لەبەر ئەوەی که گوناهەکەی کردییه یەکسەر پێ دەشکێتەوه و پەشیمان دەبێتەوه چاوی فرمێسکی لێدێ دڵی هەردەقرچێ ئەوجا شەرم دەکات له خوای گەورە سەر دادەنوێنی هەردەم دوعا دەکات که خوا لێی خۆشبێ تا ئەو گوناهە وای لێدەکات دەبێته تۆبەکارێکی چاو بەفرمێسکی هەردەم دەست بەپاڕانەوه لەخوای پەروەردگاری لێ دەردەچێ تا دەچێته بەهەشت،ئەویتریش که کردەوەیەکی چاك دەکات هەندە خۆی پێ مەزن وگەورە دەبێ پێی وایه ئەو کات پێی جیادەبێتەوه لەخەڵکی تر خۆی لەلا گەورە دەبێت بەخۆی دەنازێ و شانازی بەخۆی دەکات, ئا ئەو کاتەی هەم وا دەیلێتەوه تا به هیلاك دەچێت جا دەیباته ناو ئاگری دۆزەخ پەنا بەخوای گەورە. جا ئەوه وامان لێدەکات بەرامبەر نیعمەتەکان شوکرانه بژێر بین وە بەرامبەر تاقیکردنەوەکانیش ئارامگربین پاشان ئەگەر تاوانمان ئەنجامدا داوای لێخۆشبوون له خوای گەورە بکەین ئەگەر مرۆڤ ئەوەی کرد ئەوا بەڕاستی بەختەوەر دەبێ.بەر ئەو فەرموودەیه دەکەوێ که پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرمووێ که له صحیح مسلیم به ژمارە (٢٩٩٩) که (سوهەیب)ی ڕۆمی (رضي الله عنه)ڕیوایەتی کردووه پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی ((عَجَباً لأَمرِ الْمُؤمنِ إنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيرٌ وَلَيْسَ ذَاكَ إِلَّا لِلْمُؤمِنِ إنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكَانَ خَيراً لَهُ وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ فَكَانَ خَيَراً لَهُ)) واته: سەرسوڕمان بۆ کاروباری بڕوادار بەڕاستی کاروباری بڕوادار هەمووی چاکەیه ئەوه تەنها بۆ

بڕوادارە بۆ کەسی تر نییە ئەگەر بەرفراوانی و ژیان خۆشی تووش بوو ناز و نیعمەتی بەسەرداباری سوپاس گوزاری دەکات بۆ خوای پەروەردگار ئەوە چاکەیە بۆی, وە ئەگەر توشی ناخۆشی وبەرتەنگی و تەنگەشەی تووش بوو ئارامی لەسەر دەگرێ ئەوەشیان چاکەیە, بۆ باوەڕدار ژیانی هەموو چاکەیە ئەگەر بەم شێوەیە لە ئیسلام گەیشتبێ.

## وانەی دووەم

اعْلَمْ أَرْشَدَكَ اللهُ لطاعَته أَنَّ الْحَنيفيّة ملَّة إبْراهيم أَنْ تَعْبُدَ اللهَ وَحْدَهُ مُخْلصاً لَهُ الدِّين ، كَما قَالَ تَعالى: {وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالأنْسَ إلاَّ لِيَعْبُدُون} (الذاريات آية: ٥٦).
فَإذا عرَفْتَ أَنَّ اللهَ خَلَقَكَ لعبادَته، فَاعْلَمْ أَنَّ الْعبادَةَ لا تُسمّى عبادَةً إلّا مع التَّوْحيد، كَما أَنَّ الصَّلاةَ لا تُسَمّى صَلاةً إلّا معَ الطَّهارَة؛ فَإذا دَخلَ الشِّرْكُ في الْعبادَة فَسَدَت، كَالْحَدَث إذا دخلَ في الطَّهارَة.
فَإذا عرَفْتَ أَنَّ الشِّرْكَ إذا خالَطَ الْعبادَةَ أَفْسَدَها وأَحْبَطَ الْعَمَلَ وصارَ صَاحبَهُ من الْخالدينَ في النّار، عَرَفْتَ أَنَّ أَهَمَّ ما عَلَيْكَ معْرِفَةَ ذَلك، لَعَلَّ اللهُ أَنْ يُخلصَك منْ هَذه الشَّبَكَة، وَهي الشِّرْكُ بِاللّه، الذي قَالَ اللهُ تعالى فيه: {إنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلكَ لِمَنْ يَشَاءُ}(النساء آية: ٤٨) . وَذَلكَ بِمَعْرِفَةِ أَرْبَعِ قَواعِدَ ذَكَرَها اللهُ تعالى في كِتابِه:

هەرلە پێشەکیەکەین تەواوکەری وانەی یەکەم (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب)(رحمه الله) لەدوای ئەوەی پێشەکیەکەی بە ﴿أسأل الله الكريم رب العرش العظيم﴾دەستی پێکرد تاوەکو لەوانەی پێشتر گەیشتینە﴿فإن هؤلاءالثلاث عنوان السعادة﴾ لەو وانەیەی گەیشتینە سەر﴿اعلم﴾ (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله) هەروەکو پیشەی هەمیشەیی خۆی لە نامیلکەو نوسراوەکانی وشەی ﴿اعلم﴾ و دوعاو پاڕانەوە لەدوای ﴿اعلم﴾ەوە زۆری بەکارهێناوە ئەوەش نیشانەی هەڵبژاردنی شێوازی جوانی وانە وتنەوەیە وە نوسراو و نامیلکەکانیەتی بە ﴿اعلم﴾دەست پێکردووە.
لەسەرەتا فەرمانت پێدەکات ﴿اعلم﴾بۆ کارێکی گرینگ لەدوای خۆی دێت بەکاردەهێندرێت لەماناو واتای فەرمانە فەرمانیش بە ﴿اعلم﴾واتە بزانە (علم)زانستیت هەبێ پەیدای بکە , زانست بەمانای ئەوە دێت ئەوەی لە مێشك دایە لەگەڵ واقع تێك بکاتەوە لەسەر ڕای هەندێك لەزانایان, بەلگەشت بۆی هەبێت ئەوە ڕای پەسەندو تەواوترە.
جا بزانە﴿أرشدك الله لطاعته﴾ چونکە فەرمانت پێدەکات قورسە لەسەر شان و ئەستۆی کەسەکان کە فەرمانیان پێدەکرێ یەکسەر دوعا و پاڕانەوەشت بۆ دەکات هەوڵدەدات

تێتبگەیەنێت كە ئەو فەرمانەی من بۆ شكانەوە و بار قورسی نییە, بەڵكو بۆ ئەوەیە كە دڵسۆزم بۆ تۆ, كارەكە پێویستەو پێویستە تۆ بیزانیت جا ئەو پیاوە بەڕێزە دوعای خێرت بۆ دەكات و دەفەرمووێ ﴿أرشدك الله لطاعته﴾ خودا سەر ڕاستت بكات بۆ جێبەجێ كردنی فەرمانەكانی ﴿أرشد﴾ لە زمانی عەرەبی بەمانای ئەوە دێت كە خوا هیدایەت و ڕێنمونیت بكات وە سەرت بخات و پشتگیریت بكات بۆ (رشد),وە (رشد)یش لە زمانەوانیدا لەلایەن زاناكانی ئەهلی سوننەو جەماعە لەزاراوەی قورئانیش هەر بەمانای **(العلم نافع وعمل الصالح)** واتە زانستی بەسوودو بەكەڵك وە كاروكردەوەی چاك دێت, هەندێك مفسرین وایان تەفسیر كردووە لە﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى﴾(البقرة آية: ٢٥٦).ئەو (رشد)ە لەسەرەتای ئایەتەكە هاتووە بەمانای ڕێبازی پێغەمبەرە (ﷺ)و (غەی)ش ڕێبازی (ئەبو جەهل) ـە, واتە (رشد) علم وزانستی سوود بەخش وبەكەڵكیش لەسەروی هەموویانەوە لەهەموویان بەسوودتر (التوحید) و خوا بەیەكگرتنە وە ڕێبازەكەی پێغەمبەرە(ﷺ)ئەوەی لەخۆ گرتووە و چاكیشە,وە ﴿لطاعته﴾ لە زمانەوانیدا لەلایەن زانایان بۆ ئەوە بەكاردێ بۆ جێبەجێكردنی فرمانەكانی خوای گەورە, واتە خودا سەر ڕاستت بكات و ڕێنمونیت بكات بۆ جێبەجێكردنی فەرمانەكانی.

جا لەپاشان دەفەرمووێ ﴿أن الحنيفية ملة إبراهيم﴾جا بەڕاستی ڕێی پاكی بەدەر لە شیرك و هاوبەشی و لادراو لە شیرك وهاوبەشی كە ڕێبازی (ابراهیم)ـە(عليه الصلاة والسلام)بریتیە لەوەی ﴿أن تعبد الله وحده مخلصا له الدين﴾ بەتەنها (الله) بپەرستی وە شیرك وهاوبەشی بۆ ئەنجام نەدەیت وە ئیخلاص و یەكلاكەرەوەت هەبێت دووربێت لە ریا و هاوبەشی كە ڕێبازو دینەكە ئاوایە خوای گەورە ناردوویتی كە پێی ڕازییە ئەو خوایە ئەم ڕێبازەی بۆ تۆ ناردووە وەكو خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿قُلْ إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ اللَّهَ مُخْلِصًا لَهُ الدِّينَ * وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ الْمُسْلِمِينَ﴾ (الزمر آية:١١-١٢) واتە: پێیان بڵێ من فەرمانم پێكراوە خودا بپەرستم بە ئیخلاص و دووربم لە شیرك وهاوبەش و ریا , ئەوە ڕێبازی خوا پەرستن وبەیەكگرتنە, فەرمانم پێكراوە كە من ببم بەیەكەم لە مسوڵمانەكان . پاشان دەفەرمووێ ﴿قُلِ اللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَهُ دِينِي﴾ (الزمر آية: ١٤) واتە: بڵێ من ئەو (الله) یەی دەپەرستم بە ئیخلاص و دوور لە شیرك و هاوبەشی و ریا

کە دین و ڕێبازی بۆ هەڵبژاردووم کە مەبەستی ڕێبازی پێغەمبەر ئیبراهیمە (علیه الصلاة والسلام). جا خوای گەورە دەفەرموێت ئەو ڕێبازە بریتیە لە چ﴿أَنْ تَعْبُدَ اللهَ وَحْدَهُ مُخْلِصاً لَهُ الدِّين ﴾خوای گەورە دەفەرمووێت﴿اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ﴾ (الأعراف آية: ٦٥)واتە:ئێوە خوا بپەرستن بە تاکو تەنهایی هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە جگە لە(الله). یان دەفەرمووێت﴿اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾ (النحل آية: ٣٦)واتە:ئێوە تەنها خوا بپەرستن و دووربکەونەوە لە تاغوتەکان .(تاغوت) ئەو کەسەیە کە دەپەرسترێ بێجگە لە خوای گەورە وە ڕازییە بەپەرستنەکەی.

جا کەواتە بۆمان بەدیارکەوت کە ڕێبازی تەواوی دوور لەشیرك و هاوبەشی کە ڕێبازی پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام) وە ڕێبازی پێغەمبەرمانە محمد (ﷺ)کە بریتیە لە پەرستنی خوای گەورە بە ئیخلاص وە دوور لە شیرك و هاوبەشی و ریا, ﴿كما قال تعالى﴾هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْأِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذاريات آية: ٥٦)واتە:خودا فەرموویەتی من جنۆکەو مرۆڤم بەدینەهێناوە مەگەر بۆ پەرستش نەبێ واتە بۆ پەرستنی خۆم بەدیهێناون بۆئەوەم بەدینەهێناون کە شیرك و هاوبەشی و گوناهو تاوان ئەنجام بدەن.

﴿فإذا عرفت أن الله خلقك لعبادته﴾ جا ئەگەر تۆ زانیت ئەی کەسی بڕوادار ئەی مرۆڤ کە خوای پەروەردگار تۆی بەدیهێناوە لە پێناو پەرستنی خۆی, ﴿فاعلم﴾ بشزانە ﴿أن العبادة لا تسمى عبادة إلا مع التوحيد﴾ عیبادەت و پەرستش پێی ناگوترێ عیبادەت و پەرستش مەگەر لەگەڵ خوا بەیەکگرتن و تەوحید ئەنجامی بدەیت, جا ئەگەر شیرك و هاوبەشی لەگەڵ ئەنجامدا ئەوا کارە چاکەکەت و عیبادەتەکەت هەڵدەوەشێتەوە هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾ (الزمر آية: ٦٥)واتە:ئەگەر شیرك و هاوبەشی ئەنجامبدەی ئەوە کاری چاك و عیبادەتت هەڵدەوەشێتەوە .وە خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (الأنعام آية: ٨٨)واتە:ئەگەرشیرك و هاوبەشی ئەنجام بدەن ئەوا هەموو ئەو کارو کردەوە چاك و عیبادەتانەی ئەنجامتان داوە لێتان وەرناگیرێت و هەڵدەوەشێتەوە.

لەپاشان دەفەرموێ﴿كما أن الصلاة لا تسمى صلاة إلا مع الطهارة﴾ ئەوە نموونەیە بۆمان دەهێنێتەوە شێوازێکی جوانە لەدوای ئەوەی تێی گەیاندین (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب)

(رحمه الله) خوا پاداشتی بداتەوە بەبەڵگە هێنایەوە كە ڕێبازی پێغەمبەر ئیبراهیم(عليه الصلاة والسلام)بریتیە لە پەرستنی خوای گەورە بەبێ شیرك و هاوبەشی, خوای گەورە لە پێناو پەرستنی خۆی ئێمەی بەدیهێناوە, جا مادەم عیبادەت ئەوەندە گرینگە دەبێت بشزانی عیبادەت و پەرستنی خوای گەورە ئیڵلا دەبێت تەوحیدی لەگەڵ دابێت دووربێت لە شیرك و هاوبەشی ئەگەرنا لێیت وەرناگیرێ, هەر وەكو دەفەرمووێت﴿كما أن الصلاة لا تسمى صلاة إلا مع الطهارة﴾ هەروەكو نوێژ بەڕاستی پێی ناگوترێت نوێژ و لێت وەرناگیرێت ئیڵلا دەبێت دەستنوێژت هەبێت وە بەپاكی بیكەیت و دوور بێت لە بێدەست نوێژی وبەدەستنوێژەوە بیكەیت, ﴿فإذا دخل الشرك في العبادة فسدت﴾ جا ئەگەر شیرك و هاوبەشی بچێتە ناو عیبادەت و پەرستش ئەوە بەڕاستی بۆگەنی دەكات وگەندەڵی دەكات و تێكی دەدات, ﴿كالحدث إذا دخل في الطهارة﴾ هەر وەكو بێ دەستنوێژی ئەگەر بچێتە ناو دەستنوێژەوە, كەسێك ئەگەر دەستنوێژی هەبێت توشی بێدەست نوێژییەكی ببێ ئەوكاتەی چوو دانیشت خۆی بەتاڵ كردەوە بۆ ڕوونكردنەوەی شەرعی و وانە وتنەوە شەرم لەدیندا نییە ئەوكاتە كە قەزای حاجەی كرد بێدەستنوێژ دەبێت ئەوا دەستنوێژەكەی لەدەست دەدات و دەشكێت, ئا ئەوها ئەگەر عیبادەت شیرك و هاوبەشی كەوتە ناوێ ئەوا دەشكێت و بەتاڵی دەكاتەوە و وەرناگیرێت و لێت قبوڵ ناكرێت.

لەپاشان دەفەرمووێت ﴿فإذا عرفت أن الشرك إذا خالط العبادة﴾ جا ئەگەر زانیشت شیرك و هاوبەشی هاتۆتە ناو عیبادەتەكەت ﴿أفسدها﴾ گەندەڵ و بۆگەنی دەكا و تێكیدەداو نایهێڵێت ﴿وأحبط العمل﴾ وە عەمەلەكەت تەواو هەڵدەوەشێنێتەوە ڕەشی دەكاتەوە, ﴿وصار صاحبه من الخالدين في النار﴾ وە خاوەنی ئەو شیرك و هاوبەشییەی كە لەگەڵ عیبادەتەكە تێكەڵی كردووە دەیكاتە هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخ پەنا بەخوای گەورە,

﴿عرفت أن أهم ما عليك هو معرفة ذلك﴾ كەزانیشت گرینگترین شت لە ئەستۆی تۆ بێت و لەسەرت بێت شارەزابوون و فێربوونی ئەوەیە, واتە شارەزابوون و فێربوونی خوا بەیەكگرتن و شیرك و هاوبەشییە تا شیرك و هاوبەشی نەكەیت لێی دووربیت و توشی نەبیت ﴿لعل الله أن يخلصك من هذه الشبكة﴾ بەڵكو بە ئومێدی ئەوەی خوای پەروەردگار ڕزگارت بكات لەو تۆڕەی

كەبريتيە لە﴿وهي الشرك بالله﴾ شيرك و هاوبەشی دانان بۆ خوای پەروەردگار, ﴿الذي قال الله تعالى فيه﴾ ئەو شيركەی كە خوای گەورە لەبارەيەوە فەرموويەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾(النساء آية: ٤٨)**واته:**بەڕاستی (الله) خوای پەروەردگار خۆش نابێت لەشيرك وهاوبەشی بەڵام جگە لەشيرك و هاوبەشی هەر گوناهو تاوانێكی تر ئەگەری هەيە خوای گەورە لێت خۆشبێت بەبێ تەوبەو گەڕانەوە بۆ لای خوای پەروەردگار .

جا لێرە بۆمان دەركەوت شيرك و هاوبەشی مەترسيدارە دەبێت لێی هۆشيار بين ئاگادارببين شيرك دابەش دەبێت بۆ دوو جۆری سەرەكی .يەكەم شيركی گەورە خاوەنەكەی دەباتە دەرەوە لە ئيسلام وە ئەگەر لەسەری بمرێت پەنا بە (الله) بۆ هەميشەيی لە ئاگری دۆزەخ دەمينێتەوە وە خوای گەورە لێی خۆشنابێت كردەوەكانی هەڵدەوەشێنێتەوە, وەدووەم شيركی بچووك بەو مانايەی لەهەموو تاوانەكانی تر گەورەترە بەڵام لە ئيسلام و ئيمان نايباتە دەرەوە . خوای گەورە ئايەتی زۆری دابەزاندووە دەربارەی شيرك و باسيان دەكات دەفەرمووێت ﴿ إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾(النساء آية: ٤٨). وە لەجێگايەكی تر دەفەرمووێت ﴿إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ﴾ (المائدة آية: ٧٢)واتە:بەڕاستی ئەوەی شيرك وهاوبەشی بۆ (الله) پەيدا بكات ئەوا بێگوان بەڕاستی خودای پەروەردگار بەهەشتی لەسەر حەرام دەكات.يان دەفەرمووێت﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أُولَئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ﴾ (البينة آية: ٦)واتە:بەڕاستی ئەوانەی كافرن لە خاوەن نامەو پەرتووك و كتابەكان وەموشريك وهاوبەش پەيداكاران هەميشەيين لەئاگری دۆزەخ ئا ئەوانە خراپترينی بەديهێنراوانن.

يان دەفەرمووێت ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ (الزمر آية: ٦٥)يان دەفەرمووێت﴿وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾(الأنعام آية: ٨٨)﴾.

جا لێرە زانيمان شيرك و هاوبەشی خەتەرناكە دەبێت زۆر لێی هۆشيار بين و ئاگاداربين وەنەمانگرێتەوە وە ئەهلی سوننەو جەماعەش لەسەر ئەوەی ئايا ئەگەر تەوبە بكەين لەسەر شيرك و هاوبەشی ئەوا ئەو گوناهەمان ڕەشدەبێتەوە, بەڵێ بە تەوبە كردن هەموو گوناهێك بەشيرك و هاوبەشيشەوە ڕەش دەبێتەوە, بەڵام ئەگەر مەرجەكانی لێ بێتە جێ, بەڵام بەبێ

تەوبە بمرێ لەسەر شیركی گەورە بەیەك دەنگی لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە لێی خۆش نابێ, بەڵام شیركی بچووك ئیختلافی لەسەرە كۆمەڵێك دەڵێن ئەگەری هەیە خوای گەورە لێی خۆشبێت بەڵام هەندێكی تر دەڵێن شیركی بچووكیش بەبێ تەوبە خوای گەورە لێی خۆش نابێ, بەڵام گوناهەكانی تر جگە لە شیرك و هاوبەشی ئەگەر كەسەكە بەبێ تەوبەش لەسەری بمرێ خوای پەروەردگار بەمەشیئەت ویستی خۆ ئەگەر بیەوێ هەیە لێی خۆشببێ.

جا(شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب) دەفەرموێت﴿وذلك بمعرفة أربع قواعد ذكرها الله تعالى في كتابه﴾ ئەو شیرك و هاوبەشیەش بەچوار بنەما دەناسرێت كە خوای گەورە لە پەرتووكەكەی خۆی باسیكردووە.

## وانەی سێیەم

لەسەر ئەو پێشەكیەی (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب) كە لە دوو وانەی ڕابردوودا ڕاڤەو شەرحێكی كورت و پوختمان كرد چەند پرسیارێكمان داناوە تەنها لەسەر پێشەكییەكەی كە (25) پرسیارە بەوەڵامەوە ئەوە داواكراوە لە قوتابیە بەڕێزەكان كەوا پرسیارەكان جوان تێبگەن و وەڵامەكانی بەجوانی لە مێشك و دڵیان جێگیر بكەن, ئەو پرسیارانە كە هاتە پێشیان ئەو وەڵامانەی بۆ بنووسن و بۆی دیاری بكەن ڕۆژانەش سوود و كەڵكی لێ ببینن.

## پرسیار و وەڵامەكان

یەكەم: مانای ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ بەكورتی و پوختی چییە؟

وەڵام: بەیارمەتی ناوی﴿الله﴾ ئەم كارە دەكەم جا هەر كارێك بكەیت ئەوە مەبەستت دەبێت, ﴿الله﴾ناوی كۆكەرەوەی هەموو ناوە زۆر جوانەكان و سیفەتەكانی خودایە واتە پەرستراوی شایستەی پەرستن, ﴿الرحمن﴾ لەسەر وەزنی (فعلان)ـە سیغەی موبالەغەیە واتە بەزەیی فراوان كە هەموو شتێك لەخۆی دەگرێت, ﴿الرحيم﴾ لەسەر وەزنی (فعیل)ـە بەمانای (فاعل) دێت واتە خوای خاوەن بەزەیی و گەیێنەر بەوەی شایستەی بەزەییە لەهەر كات و شوێنێكی هەر كەسێكی كە بیەوێت پێی بگەیەنێت پێیدەگەیەنێت.

دووەم: مانای ﴿أن يتولاك في الدنيا والآخرة﴾ چییە؟

وەڵام: واتە لە دونیاو دواڕۆژ كارو ئیشەكانی هەردووكیان خوای پەروەردگار پشتگیری كارو یارمەتی دەرت بێت.

سێیەم: پشتگیری و یارمەتی دانی خوا بۆ بەندەكانی چەندە و چەند جۆرە؟

وەڵام: پشتگیری خوا بۆ بەندەكانی دوو جۆرە :

1- پشتگیری تایبەت بۆ ئەو بڕوادارانەی کە بڕوای تەواویان بە خودای پەروەردگار هەیە لەخوا ترسانیان هەیە و پارێزکارن هەر وەك خوای گەورە فەرموویەتی ﴿أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ * الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾ (يونس آية: ٦٢-٦٣)واتە: ئاگاداربن بەڕاستی دۆست و وەلیانی خوا ترسیان لەسەر نییە و غەمگینیش نین ئەوانەی بڕوایان هێناوەو پارێزکاری دەکەن .

2- پشگیری و یارمەتی گشتی بۆ هەموو بڕوادارێکە چەندی گوناه کاریش بێت مادام لە بڕواداری دەرنەچووبێت و کافر نەبووبێت, خوای پەروەردگار فەرموویەتی کە دوعاو پاڕانەوە دەکەن﴿أَنْتَ مَوْلَانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ (البقرة آية: ٢٨٦).واتە :ئەی خوای پەروەردگار تۆ دۆست و پشتگیری کاری ئێمەیت جا سەرمان بخە بەسەر کۆمەڵەی بێباوەڕاندا.

چوارەم:مانای ﴿مبارکا﴾ چییە ؟

وەڵام: پیت وبەرەکەت و چاکەت بۆ خودی خۆت و جگە لەخۆت دەگەیەنێت واتە کەسیٚ کە پێی دەگوتریٚ﴿مبارکا﴾ لە خودی خۆیدا چاکەی هەیە و خاوەن پیت و بەرەکەتە, وە ئەو چاکەو پیت و بەرەکەتەی دەتوانێت بگەیەنێت بەکەسێکی تریش وخەڵکی تریش سوودی لیٚ ببینێت.

پێنجەم: ئایا دروستە وشەی ﴿**تبارك**﴾ یش بۆ مرۆڤ بەکار بێت هەر وەکو ﴿مبارکا﴾ بەکاردێت؟

وەڵام: نەخێر چونکە کەس ئەوەی لەتوانادا نییە ﴿**تبارك**﴾ واتە پیت و بەرەکەت و خێر بخاتە ناو شتەکان و پێیان ببەخشێت ئەوە تەنها لە توانای (الله)یە تەنها بۆ ئەو دەبێت, بەلاٚم﴿مبارکا﴾ بۆ مرۆڤەکان و بەدیهێندراوەکانیش دەبێت واتە ئەوەی پیت وبەرەکەتی پێبەخشراوە لەلایەن خودای پەروەردگار, هەروەکو خوای پەروەرگار دەفەرمووێ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا﴾(الفرقان آية: ١). واتە:گەورەیی و مەزنی بۆ ئەو خودا پەروەردگارەی کەوا(فرقان) واتە قورئان جیاکەرەوەی نێوان ڕەوایەتی و ناڕەوایەتی دابەزاندووە بەسەر بەندەکەی تا ببێتە ترسێنەر بۆ جیهانیان.

شەشەم: مەبەست لە ﴿شكر﴾ چییە؟
وەڵام:هەڵسان بەجێبەجێكردنی مافەكانی و نازونیعمەت وبەخشینەكانی خودای پەروەردگار ئەویش بەو خاڵانە دەكرێ:
1- دانان بەوەی كە هەموویان لەخواوەیە ئەو بەخششە بەدڵ دانی پێدابنێین كە خوای پەروەردگار پێی بەخشیوە.
2- باسكردنی نازو نیعمەتەكان و پاڵدانی بۆ لای خوای پەروەردگار﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾(الضحى آية: ١١).
3- بەكارهێنانی نازو نیعمەتەكان لەپێناو ڕەزامەندی خوای پەوەردگار.
كەواتە ﴿شكر﴾ سوپاسگوزاری بەدڵەو هەم بەزمانیشەو هەم بە كرداریشە.

حەوتەم: مەبەست لە ﴿صبر﴾ چییە؟وەجۆرەكانی چەندە؟
وەڵام :﴿صبر﴾ ئارامگرتن و خۆراگریە وە سێ جۆرە:
1- ئارامگرتن وخۆڕاگری لەسەر فەرمانەكانی خوای پەروەردگار وە بانگەوازی كردن بۆ لای خوای پەرورەدگار .
2- ئارامگرتن و خۆڕاگری لەسەر گوناه و تاوانەكان.
3- ئارامگرتن و خۆراگری لەسەر تاقیكردنەوەو قەدەرەكانی خوای پەروەردگار كەبەسەرت دێت لەناخۆشی و ژان كە تیایدا هەیە.

هەشتەم: بڕوادار چۆن دەتوانێ ﴿صبر﴾ بگرێ لە ناخۆشی و تاقیكردنەوەكان؟
وەڵام:بەسێ خاڵ دەتوانێ ئارامگر بێت:
1- ئارامی و صبر گرتنەكەی لە پێناو خوا بێت و هیچ مەبەستێكی تری نەبێت, خوای پەروەردگار دەفەرمووێت﴿وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ﴾ (المدثر آية: ٧). واتە:لە پێناو پەروەردگارەكەت ئارمگر بە.
3- ڕازی بێت بەتاقیكردنەوەكە وپێی ناخۆش نەبێت كە خوا ئەوەی بەسەر هێناوە.

4- ئارامگرتنەکەی لە کاتی سەرەتای تاقیکردنەوەکەبێت, وەکو پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی کە لە صحیحی بوخاری بەژمارە (١٣٠٢)وە لە صحیحی مسلیم بە ژمارە (٩٢٦) تۆمار کراوە((الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الْأُولَى))واتە: صبرو ئارامی لەکاتی توشبوونی سەرەتایی بەڵاو ناخۆشی و موصیبەتەکەیە.

نۆیەم: مەبەست لە ﴿استغفار﴾ چییە؟

وەڵام:﴿استغفار﴾ داواکردنی داپۆشینی گوناه و تاوانە وسڕینەوەی شوێنەوارەکانیەتی .

دەیەم: ئایا بڕوادار گوناه دەکات یان نا؟ ئەگەر گوناهی کردو لێی گەڕایەوەش ئەوا حوکمی چییە؟

وەڵام:بەڵێ هەموو بڕواداڕێك ئەگەری هەیە تاوان بکات, وە خوای پەروەردگار تەنها پێغەمبەرانی(علیهم الصلاة والسلام)پاراستووە وەکو پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی ((الْمَعْصُومُ مَنْ عَصِمَ اللہ))صحیح بوخاری بە ژمارە(١٣٠٢). واتە: پارێزراو لە گەناهو تاوانەکان تەنها ئەوانەن کە خودا ئەوانی پاراستووە کە پێغەمبەرانن(علیهم الصلاة والسلام), وە بە تەوبە ڕەش دەبێتەوە گوناه و تاوانەکانی،وە بڕوادار خاوێن دەبێتەوە لەگوناه و تاوانەکانی گەر بەردەوام بێت لەسەر تەوبەکەی و پاداشتی دەست دەکەوێ لەلای خوا پەروەردگار.

یازدەم: مانای ﴿فإن هؤلاء الثلاث عنوان السعادة﴾ چییە؟

وەڵام: بەڕاستی ئەو سێیانە ﴿شکر﴾ و ﴿صبر﴾و﴿استغفار﴾ ناونیشانی بەختەوەرین و پەژارە لابەرو غەم ڕەوێنن.

دوازدەم: مەبەست لە وشەی ﴿اعلم﴾ چییە؟

وەڵام:فەرمان کردنە بەفێربوون و زانستی بەدەست هێنان.

سێزدەم: پێناسەی عیلم و زانست چییە؟

وەڵام:﴿العلم﴾ زانست بریتیە لە ناسین و فێربوونی شتێك بەتەواوی و ڕاستیەکەی کە ئەو شتە هەیەتی و لە واقیعدا لەسەریەتی جا بە سێ خاڵ لەلای زۆرینەی زانایان (علم) پێی دەگوترێ (علم) و زانست:

1- یەکلابوونەوەی بڕوایەو کەسەکەش شتەکەی لەلا دڵنیا بێت شك و گومانی تیا نەبێت جا ئەوەی خاوەن شك و گومانە لە شتێکی دا پێی ناگوترێ خاوەن زانست پێی دەگوترێ گومانبەر.

2- زانراوەکە دەبێت لەگەڵ حاڵ و باڵ و ڕاستی تێك بکاتەوە لەواقیعدا بوونی هەبێت و لەگەڵی تێك بکاتەوە ئەگەر لەگەڵی تێکی نەکردەوە پێی ناگوترێ زانست.

3- ئەوە بە پێی بیرو بۆچونی هەندێ لەزانایان وایە دەبێت بەڵگەی لەسەر هەبێت, کە ئەوە ڕای هەموو زانایان نیە .

کەواتە هەر خاڵ و شتێك لە زانیاری و زانستەکان ئەگەر بێتو لەگەڵ واقیع تێکی کردەوە کەسەکە لێی دڵنیا بوو و بەڵگەشی لەسەر هەبوو ئەوە پێی دەگوترێت زانست.

چواردەم: مانای ﴿أرشدك الله لطاعته﴾ چییە؟

وەڵام: خودا سەر ڕاست و ڕێی ڕاستت بکات و ڕێگاکانی جێبەجێکردنی فرمانەکانی بۆ ئاسان بکات و پشتگیری کارت بێت لە کردنیاندا .

پازدەم: مەبەست لە وشەی ﴿الطاعة﴾ چییە؟

وەڵام: جێبەجێکرنی فەرمانەکان و دووركەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکان دەگەیەنێت.

شازدەم: مانای﴿الحنيفية ملة إبراهيم﴾ چییە؟

وەڵام:﴿الحنيفية﴾ لادان لە هاوبەشی و شیرکەوە بەرەو خودا بەیەکگرتن وتەوحید وە﴿ملة إبراهيم﴾ واتە ئاین وڕێبازی پێغەمبەر ئیبراهیم(عليه الصلاة والسلام)هەروەکو خوای پەروەردگار فەرموویەتی ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ * شَاكِرًا لِأَنْعُمِهِ﴾(النحل

آية: ١٢٠-١٢١). جا عیبادەت و پەرستشیش بەوەی دەکرێت کە کەسەکە خۆی ملکەچ و گەردەن کەچ بێ لەجێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوای پەروەردگار,وە خۆشەویستیشی لەگەڵدا بێت , واتا هەم خۆی بەکەم بزانێ وگەردن کەچ و ملکەچ بێ بۆی و هەم خۆشیشی بوێت و خۆشەویستی لەگەڵ بێت.

**حەڤدەم:** بەچی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوا دەبێتە( پەرستش)؟

وەڵام:بە چوار خاڵ:

1- خۆ بەکەم گرتن و دڵ کەچی و ملکەچی بوون.

2- ترسان لەوەی خودا تۆڵەی لێبستێنێ بە ئەنجام نەدانی فەرمانەکانی و بە کردنی قەدەغە کراوەکانی ﴿وَخَافُونِ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِين﴾(آل عمران آية: ١٧٥).

3- ئومێد بوون و ڕەجا بوون بە پاداشتەکانی خودا ﴿أُولَئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ اللَّهِ﴾(البقرة آية: ٢١٨).

4- خۆشەویستی خوا وفەرمانەکانی خوای خۆش بووێت﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ﴾(البقرة آية: ١٦٥).

هەژدەم:مەرجەکانی پەرستش وەرگرتن و قەبوڵ بوونی لەلای خودای پەروەردگار چەندە و چین؟

وەڵام:دوو مەرجە:

1- یەکلا بوونەوە و (الاخلاص) بوون

2- (الصواب) شوێنکەوتەبوونی ڕێبازی خوداو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) و لەگەڵ شەریعەتەکەی تێك بکاتەوە.

**نۆزدەم:** مانای ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالأَنْسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذاريات آية: ٥٦). چییە؟

وەڵام:وات: خودا فەرموویەتی جنۆکەو مرۆڤم بەدینەهێناوە مەگەر بۆ پەرستن و پەرستشی خۆم نەبێ کە دەبێت بە تەوحید و خوا بەیەکگرتنەوە ئەم پەرستشە ئەنجام بدرێت دوور بێت لە شەریك و هاوبەشی و ریا.

بیستەم: ئایا پەرستش  بەبێ تەوحید و خودا بەیەككگرتن دەبێتە پەرستش؟

وەڵام:نەخێر هەموو پەرستشێك دەبێ خودا بەیەككگرتنی تیابێت لەگەڵ بێت, خوا بەیەككگرتنیش بەبێ كوفر بە تاغوت جێگیر نابێت هەر وەك خودای گەورە فەرموویەتی ﴿فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى﴾ (البقرة آية: ٢٥٦). واتە: بێگومان ئەوەی كافر بێ بە تاغوت و بڕوابێنێت بە (الله) ئەوە دەستی گرتووە بە  قوڵپ و دەستگری پتەو و بەهێز.

بیست و یەك: پێناسەی ﴿تاغوت﴾ بەكورتی چییە؟

وەڵام: هەركەس و شتێك بپەرسترێت جگە لە خوای پەروەردگار یان لەگەڵ خوای پەروەردگار وە ئەو كەس و شتە  ڕازی بێت بەو پەرستشە كە بۆی ئەنجام دەدرێت ئەوە تاغوتە.

بیست و دوو: ئایا نوێژ دروستە بەبێ دەست نوێژ ئەنجام بدرێت؟

وەڵام:نەخێر ئەگەر دەست نوێژت نەبێت نوێژەكەت لێوەرناگیرێ وە دروست نابێت و پێی ناگوترێ نوێژ, جا پەرستشیش بەهەمان شێوە ئەگەر خوا بەیەككگرتن و تەوحیدی لەگەڵ نەبێ وە دوور نەبێت لە شیرك و هاوبەشی پێی ناگوترێ پەرستش و  عیبادەت.

بیست و سێ: هەر پەرستش و كارێكی چاك ئەگەر  لەگەڵ شیرك و هاوبەشی ئەنجام بدرێ چی لێدێت بە نموونەو بەڵگەوە وەڵام بدەوە؟

وەڵام:تێكەڵكردنی شیرك و هاوبەشی بە كاری چاك و پەرستش ئەو كاتە بەتاڵی دەكاتەوە هەروەكو دەست نوێژ شكان  نوێژەكەت لێ ناهێڵێت و بەتاڵی دەكاتەوە,  بۆیە پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێت ((قَالَ  اللهُ تعَالَى أنَا أغْنَى الشُّرَكاءِ عَنِ الشِّرك مَنْ عَملَ عَمَلاً أشرَكَ فيْه معي غَيري تَرَكتُهُ وَشِركَهُ ))صحيح مسلم بەژمارە (٢٩٨٥)واتە: لەو فەموودە قودسیە خودای پەروەردگار فەرموویەتی من دەوڵەمەندترینی هاوبەشان و شەریكەكانم لە شەریك وهاوبەشی, ئەوەی كە كارو كردەوەیەكی كرد كەسێكی تر جگە لەمن  لەگەڵم بكاتە شەریك و هاوبەش خۆی و شیرك و هاوبەشییەكەی واز لێدێنم  نامەوێ و وەری ناگرم.

بیست و چوار: ئەگەر زانیت هاوبەشی و شیرك پەرستش ناهێڵێت و تێکی دەدات و کاروکردەوەکانت پوچەڵ دەکاتەوە و خاوەنەکەی هەمیشەیی دەکات لە دۆزەخ کەواتە پێویستە چی بکەین و بیزانین؟

وەڵام:گرینگترین شت ئەوەیە لە شیرك و هاوبەشی شارەزابیت و بیناسی تاکو لێی قوتار بیت و تێی نەکەویت, هەروەکو خودای پەروەرگار دەفەرموویێت ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾ (النساء آية: ٤٨).

بیست و پێنج و کۆتایی: ئایا خودای پەروەردگار لە شیرك و هاوبەشی دەبوورێت؟

وەڵام:ئەوەی تەوبە بکات و وازبێنێ لە هاوبەشی چ هاوبەشی گەورە بێت یان هاوبەشی بچووك ئەوە بەیەك دەنگی زانایان بەدڵنیاییەوە خوای پەروەردگار لێی دەبوورێت و تەوبەکەی لێوەردەگرێ لەسەری ڕەش دەکاتەوە, بەڵام گوناهەکانی تر جگە لە هاوبەشی بەدڵنیاییەوە لەلای ئەهلی سوننە وجەماعە یەك دەنگن لەسەر ئەوەی دەکەوێتە بەر مەشیئەت و ویستی خودای پەروەردگار, خودا بیەوێ بەبێ تەوبەش لە خاوەنەکەی دەبوورێ و خۆش دەبێ وەئەگەر نەشیەوێ لێی نابوورێ, جا تەنها جیاوازی لەسەر شیرك و هاوبەشی بچووك هەیە ئایا بەبێ تەوبە خودای پەروەردگار لێی خۆشدەبێ یان نا زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە دوو بۆچوونیان هەیە کۆمەڵێکیان دەڵێن خوای پەروەردگار لێی خۆش نابێ کۆمەڵێکیشیان دەڵێن خوای پەروەردگار لێی خۆش دەبێت.

## وانەی چوارەم

الْقاعدَة الأولى: أَنْ تَعْلَمَ أَنَّ الْكُفّارَ الَّذينَ قَاتَلَهُم رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم مُقِرُّون بِأَنَّ اللهَ تعالى هَوَ الْخالِقُ الْمُدَبِّر، وَأَنَّ ذَلك لَمْ يُدْخِلْهُمْ في الْإِسْلام.
وَالدَّلِيلُ قَوْلُه تَعالى: {قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَنْ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَنْ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلا تَتَّقُونَ}(يونس آية: ٥٦).

گەیشتینە بنەمای یەكەم ئەو چوار بنەمایەی (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب)(رحمه الله) فەرمووی بەوانەوە شارەزای شیرك و هاوبەشی دەبین بۆ ئەوەی خۆمانی لێ دوور بگرین, بۆ ئەوەی تەوحید و خوا بەیەكگرتنمان ڕاست و دروست دەربچێتئەوە چوار بنەماكەن.

﴿القاعدة الأولى﴾ بنەمای یەكەم ﴿أن تعلم أن الكفار الذين قاتلهم رسول الله صلى الله عليه وسلم مقرون بأن الله تعالى هو الخالق المدبر، وأن ذلك لم يدخلهم في الإسلام﴾ دەفەرمووێت بزانن و شارەزا بن بەڕاستی كافرو بێبڕواكان ئەوانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)كوشتار و جەنگی لەگەڵ كردن دانیان نابوو بەوەی بەڕاستی (الله) خوای بەرز هەر ئەوە ﴿الخالق﴾بەدیهێنەر وە ﴿المدبر﴾بەڕێوەبەر, جا ئەو بڕیاردان و دانپێدانەیان ئەوانی نەخستە ناو ئیسلام وە بە مسوڵمان و بڕوادار لەقەڵەم نەدران, ﴿والدليل قوله تعالى﴾وە بەڵگەش لەسەر ئەوە فەرموودەی خوای بەرزە﴿قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَنْ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَنْ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلا تَتَّقُونَ﴾(يونس آية: ٥٦).واتە: پێیان بڵێ ئەی محمد(ﷺ)كێیە ئەو زات وكەسەی ڕزق و ڕۆزیتان دەدات لە ئاسمان و لەزەوی ئەوەی كە بیستن و بینینی ئێوەی بەدەستە و خاوەنیەتی ئەوەی كە زیندوو لەمردوو دەردەهێنێ وە مردوو لە زیندوو دەردەهێنێت وە ئەوەی بیربكاتەوەو وردبێتەوە لەكارەكان دەزانێت كێیە, كە ئەوەی كاروبارەكان بەڕێوەدەبات لەوەڵامدا ئەوان دەڵێن﴿فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ﴾ دەڵێن ئەوە خودایە.

کەواتە بڕوایان هەیە بەوەی کە ڕزق و ڕۆزی لە ئاسمان و زەوی و بەدیهێنانی مرۆڤەکان و بەدیهێندراوەکان وە لەنەبوونەوە هێنانەبوون و لەبوونەوە هێنایە نەبوون وە بەڕێوەبردنی هەموو کارەکان هەمووی ئەوە (الله) خاوەنێتی لەدەستی ئەو دایە, تۆش ئەی محمد(ﷺ)پێیان بڵێ ﴿فَقُلْ أَفَلا تَتَّقُونَ﴾ پێیان بڵێ ئەی بۆ ئێوە لەو (الله) یە ناترسن پارێزکار نابن بۆچی نابن بەخاوەنی تەوحید و خوا بەیەکگرتن مادەم ئەوەی دەزانن.

کەواتە ئەوە ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە بەتەنها بڕوابوون بەپەروەردگاریەتی خوای پەروەردگار بەوەی کە ڕۆزیدەرە وە خوای پەروەردگار دەمرێنێ و دەژیێنێ وە خودای پەروەردگار هەموو بوونەوەری بەدیهێناوە وە هەموو بەدیهێندراوەکانی بەدیهێناوە وە خاوەنیانە هەر خودایە هەموو کاروبارەکانی بەدەستە وە باران دادەبەزێنێت لە ئاسمان وە خوای پەروەردگارە دەغڵ و دان شین دەکات لەسەر زەوی هەموو ئەو کارانەی پەروەردگار ئەگەر کەسەکە دانی پێدابنێت بەوەی تەنها نابێتە مسوڵمان و بڕوادار, ئەوە ناهێنێتە بازنەی ئیسلام و مسوڵمانان و بڕواداریيەتی, لەبەر ئەوەی موشریك و کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)کاتێك کەوا ئەو بڕوایەیان هەبوو وە ئاوا دانیان پێدادەنا چونکە ئەوە خۆی لە سروشتی مرۆڤەکانەوە هەڵقوڵاوە و سەرچاوەی گرتووە, هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموویێت ((كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةَ فَأَبَواهُ يُهوِّدانِه أو يُنَصِّرانِه أو يُمَجِّسانِه))صحيح بوخاری بەژمارە(١٣٨٥) وە لە صحيح مسليم بە ژمارە (٢٦٥٨) هاتووە.واتە: هەموو منداڵێك کە لەدایك دەبێت لەسەر فیگرەت و تەوحید و خوا بەیەکگرتن لەدایك دەبێت لەدواییدا دایك و باوکێتی دەیکەنە جولەکە یان دەیکەنە نەصرانی (گاور) یان دەیکەنە ئاگر پەرست.

وە لەو سەردەمەی خۆمان دەیکەنە ئەهلی بێدینی و ڕێبازو ڕێچکەکانی سەردەم یان لەبەرچاوی خۆمان دەیکەنە لایەنەکەی خۆی یان دەیکەنە عەلمانی, کەواتە ئەو بیرو بڕوایە کە خودای پەروەردگار تاك و تەنهایە بەکردارەکانی کە (تەوحیدی ڕبوبیەت) ی پێ دەگوترێ, کە پێناسەی تەوحیدی ڕبوبیەت ئاوا دەکرێت (إِفرادُ اللهِ سُبحانَهُ وَتَعَالى بِأفعالِه)واتە: بەتاك دانانی خوای پەروەردگار لە کار و کردارەکانی, ئەوە ئەو کەسەی ناهێنێتە ناو بازنەی ئیسلام و مسوڵمان و بڕوادار کە خوێنی پارێزراوبێت, یان پێناسەیەکی تر بۆ توحید ڕبوبیە(إِفرادُ اللهِ بِالْخَلْقِ وَالْمُلْكِ والتَّدبيرِ) واتە: بڕوابوون بەوەی کە خودا تاك و تەنهایە لە بەدیهێنان کە شتی

له نەبوونەوە هێناوەتە بوون له پاشان ئەو خاوەنیانە وە ئەو دەسەڵاتی هەیە بەسەریان وە ئەویش بەڕێوەیان دەبات بەو پەڕی ڕێك و پێكی بەڕێوەبردن , ئا ئەوانە خەڵكەكەی نەكردە مسوڵمان و بڕوادار لەسەردەمی پێغەمبەری(ﷺ)یان وایان لێبكات كە پێغەمبەر (ﷺ)كوشتاریان لەگەڵ نەكات بەكافرو موشریك ناویان نەبات, بەڵكو خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز تۆماری كردووە هەر بەكافر ناوی بردوون وە بە موشریكیش ناوی بردوون وە دەفەرموویێت﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلَّا وَهُمْ مُشْرِكُونَ﴾(يوسف آية: ١٠٦). واتە: لەگەڵ ئەوەی ئەوان هەموو دەڵێن خوای پەروەردگار ئێمەی بەدیهێناوە وە ڕزق و ڕۆزیمان دەدات وە وە بیستن و بینین و ژیان و مردنمان هەمووی بە دەستی (الله) یە, لەگەڵ ئەوەی خوای پەروەردگار وتی زۆری هەرە زۆریان بڕوایان نەهێناوە, وە بڕوایان نیە بە (الله) كە تاك و تەنهایە لە تەوحید و خوا بەیەككگرتن بە تایبەتی لە پەرستش و عیبادەت ئیلا ئەوان زۆربەیان موشریك و هاوبەش پەیداكارن,مەبەستی پێی ئەوەیە كە لەئیمان و بیروبڕوایان بە پەروەردگاریێتی پەروەردگار ئائەوانە بڕوایان هەبووە بەڵام لە بیروبڕوایان لەوەی كە خوای پەروەردگار بەتاك و تەنهایی شایستەی پەرستنە نابێت شەریك و هاوبەشی بۆ ئەنجام بدەیت لەوەیەوە شیرك و هاوبەشیان ئەنجام دەداو لەوەوە بە بڕوادار لەقەڵەم نەدراون,﴿إِلَّا وَهُمْ مُشْرِكُونَ﴾واتە لە عیبادەت و پەرستشی خوای پەروەردگار شیركیان ئەنجام دەدا, هەر وەكو ابن عباس (رضي الله عنهما)لە تەفسیری ئەو ئایەتەی لە سوڕەتی یوسف فەرموویەتی ئەوە لە بیروبڕوایاندا هەبووە كە پێیان دەوترا (مَنْ خَلَقَ السَّماوات) كێیە ئەوەی ئاسمانەكانی بەدیهێناوە (وَمَنْ خَلَقَ الْأَرْض)وە كێیە ئەوەی زەوی بەدیهێناوە (وَمَنْ خَلَقَ الْجِبال) كێیە ئەوەی شاخەكان وچیاكانی بەدیهێناوە (**قالُوا الله**)ئەوان لەوەڵام دەیان گوت ئەوە (الله) یە ،

(وَهُمْ مُشْرِكُون بِهِ) لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان شیرك و هاوبەشیان بۆ خوای پەروەردگار بڕیار دەدا, وە (لات و مەنات و عوززا)یان لەگەڵ خوای گەورە دەپەرست بۆ ئەوەی لە خوای گەورەیان نزیك بكاتەوە, یان ببنە تكاكار بۆیان لای خوای گەورە كە شیرك و هاوبەشیان ئەنجام دەدا لە پەرستشدا.

ئەگەر تەماشای حاڵو باڵی كافرو موشریكەكانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)یان لە پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ)بكەین, ئەوەمان بۆ دەردەكەوێ وەكو خەڵكێكی زۆری ئێستاش دان بەوەی

دادەنێن وە دانیان بەوە دادەنا  كە خوای گەورە بوون و وجودی هەیە,  وە خوای گەورە خاوەنی  هەموو بەدیهێندراوەكانە,  وە ژیان و مردن بە دەستی خوای پەروەردگارە,  وە ڕزق و ڕۆزی بەدەستی ئەوە, وە خوای پەوەروەردگار باران دەبارێنێ  هەر ئەوە لە زەوی دەغلّ و دان شین دەكات,  بەڵام لە پەرستش و عیبادەت شیرك و هاوبەشیان بۆ خوا ئەنجام دەدا,  هەروەكو خوای گەورە دەفەرمووێ﴿أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ﴾(الأعراف آية: ١٩١ ).واتە: ئایا ئەوانە دەكەنە  شیرك و هاوبەش بۆ خوای پەروەردگار كەوا هیچ بەدی ناهێنن ئەوەیان لەدەست  نیە  هیچ شتێك بتانن لە نەبوونەوە  بهێننەبوون و دروستی بكەن بەڵكو ئەوان بەدیهێندراون لە نەبوونەوە لەلایەن خوای پەروەردگار.

جا لەپاشان دەردەكەوێت بەو ڕوونكردنەوانەكەواتە تەوحیدی ڕبوبیە ئەگەر بڕوات پێ هەبێت هیچ شەریك و هاوبەشی بڕیار نەدەی  لە تەوحیدی ڕبوبیەت  ئەوە ناتكاتە مسوڵمان و بڕوادار هەتا لە پەرستش و عیبادەت یەكلانەبیەوە  هیچ شەریك و هاوبەشی بڕیار نەدات, وە پێت وابێت كە زەرەرو قازانج بەدەست هیچ كەس و شتێك نییە  جگە لە (الله).

بەڕاستی لەو بنەمایە ئەوەمان تێدەگەیەنێت (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب)(رحمه الله) كەعەرەبەكان و موشریكەكان  لەماناو واتای (لا إلە إلا الله) ی چاكتر تێگەیشتبوون لەخەڵكی ئەو سەردەمەی خۆمان, لەبەر ئەوەی چونكە ئەوان  بڕوایان وابوو بە تەوحیدی ڕبوبیەت, شیرك و هاوبەشیان لەبواری ڕبوبیەت ی پەروەدگار پەیدا نەكردبوو, بەڵام كە دەگوترا (لا إلە إلا الله) بەدڵنیاییەوە (لا إلە إلا الله) تێیدەگەیشتن لەوەی كە بەمانای ئەوەدێت (لا معبود بحق إلا الله) لەبەر ئەوە ڕازی نەدەبوون كە دەیانووت ئێمە (لات و عوززا مەنات)یش دەپەرستین دەیانكەینە نێوان لە نێوان  خۆمان و خوای گەورە دەیانكەینە تكاكار بۆمان لەبەر ئەوەیە كەوا بڕیاری پەرستنی ئەو بتانەیان دابوو دەیان پەرستن, جا مانای (لا إلە إلا الله) یان قەبوڵ نەدەكرد بەتەواوەتی تێگەیشتبوون كە(لا إلە إلا الله) یەعنی(لا معبود بحق إلا الله) هیچ پەرستراوێكی هەق و ڕەوا نییە جگە لە (الله), نەك وەك تاقم و كۆمەڵێكی تر جگە لە ئەهلی سوننە و جەماعە كە (لا إلە إلا الله) پێناسە دەكەن شەرح و ڕاڤەی دەكەن و دەڵێن مانایواتا(لا خالق ولا مدبر إلا الله),نەخێر ئەوە ئەوەش دەگەیەنێت بەڵام مانای زیاتر و تەواوتر ئەوەیە (لا معبود بحق إلا الله)

هیچ پەرستراوێكی هەق و ڕەوا نیە جگە لە (الله), لەبەر ئەوە لەو ئایەتە دەردەكەوێ كە خوای گەورە فەرموویەتی ئەوان چیان دەگوت ﴿أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا﴾(ص آية: ٥).

ئایا محمد(ﷺ)هاتووە ئەو هەموو پەرستراوانەی ئێمە بەیەك پەرستراو ڕازیمان دەكات دەیانكاتە یەك و ئێمە هەموو ئەوانیتر واز لێبێنی .

كەواتە ئەوان بڕوایان وابوو كە خوای پەروەردگار (الله) لە پەروەردگارێتیدا تاك و تەنهایە بەڵام بۆ تكاكردن و نێوانێك لە نێوان ئەوان و خوای پەروەردگار ئەو بتانەیان دەپەرست لە تەوحیدی ئولوهیەت تێكەوتبوون وە شیرك و هاوبەشیان دەكرد لەبەرئەوەیە بەم ئایەتانە دەردەكەوێت كە موشریك و كافرەكانی سەردەمی پێغەمبەری(ﷺ)قەرداری كردونەتەوە پابەندی كردوونە بە (تەوحیدی ڕبوبیەت) كە (تەوحیدی ئولوهیەت) بێننە جێ كاتێ ئەم هەموو پرسیارانەیان لێدەكات وەكو ئەو ئایەتەی كە (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب)(رحمه الله) هێناویەتەوە ﴿قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَنْ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَنْ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾(یونس آية: ٥٦).

یان لە شوێنێكی تر دەفەرمووێت ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾(الزخرف آية: ٨٧). كە خوای گەورە پێیان دەڵێ مادەم ئێوە بڕواتان بەوە هەیە كە خوای گەورە تاك و تەنهایە لە بەدیهێنانی ئاسمان و زەوی وە ڕزق و ڕۆزی دانتان وە مردنتان و ژیانتان وە باران بارین هەمووی بەدەستی (الله) یە, مادەم بۆچی نایێن بیپەرستن وە بتەكان وازلێبێنن چونكە هەمووی بەدەستی (الله) یە هەر ئەو شایستەی پەرستنە بێ شیرك و هاوبەشی بپەرسترێت وە كاتێك ئەوان دەیان وت﴿أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ﴾(ص آية: ٥). جا دەردەكەوێت موشریك و كافرانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)ئاوا بە بێ بڕوا و موشریك لەقەڵەم دەدران وە پێغەمبەر (ﷺ)هەر شەڕو كوشتاری لەگەڵ كردن وە تەوحیدی ڕبوبیەت ئەوانی نەهێنایە ناو بازنەی ئیسلام و پێغەمبەر (ﷺ)دەستیان لێ هەڵگرێت و بە كافر و موشریك لە قەڵەمیان نەدا وە كوشتار و جەنگیان لەگەڵ نەكات.

## وانەی پێنجەم

مسوڵمانانی بەڕێزو سەنگین قوتابیانی خۆشەویست گەیشتینە سەر وانەی پێنجەم لە شەرح و ڕاڤەی (قواعد الاربع) چوار بنەماکەی (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب)(رحمه الله)جا لەو وانەیە سەرەتاکەی بە پرسیارو وەڵامەکانی بنەمای یەکەم دەستپێدەکەین .

## پرسیارو وەڵامەکان

**یەکەم**: ئایا ئەوەی دانبنێ بە پەروەردگاریەتی خواو بڕوای هەبێ خوا بەدیهێنەرەو خاوەنەو بەڕێوبەرەو تاك و تەنهایە لە کار و کردەوەکانی واتە بڕوا بوون بە (التوحيد الربوبية) خوا بەیەککگرتن لە پەروەردگاریدا ئایا ئەو کەسە دەبێتە بڕواداری خوێن پارێزراو؟یان نا؟

**وەڵام**:تاکو مرۆڤ بڕوا بە پەروەردگاری خواو پەرستراوەتی ڕەوای خوا ناوە زۆر جوانەکان و سیفەتە بەرزەکانی خوا نەهێنێ وە واز نەهێنێ لە هاوبەشی و شیرك, کوفر نەکا بە(تاغوت) نابێتە بڕوادای خوێن پارێزراو, هەروەك هاوبەش پەیداکارانی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)بڕوایان وابوو خوا پەروەردگارەو خاوەنەو بەدیهێنەرە و ڕزق و ڕۆزی بەدەستی ئەوەو بەڕێوبەری تەواوی هەموو بونەوەرانە, بەڵام لە پەرستشدا شیرك و هاوبەشیان بۆ خوا بڕیار دەدا, لەگەڵ خوا ( بت و صەنەم)ەکانیان دەپەرست, وەکو (لات و عوززا ومەنات و...هتد)کە دەیانکردنە نێوان لە نێوان خۆیان و خوای گەورە, وە دەیانگوت تکامان بۆ دەکەن لەلای خوای گەورە, ئائەو کاتەی ئەوان هەر بە هاوبەش پەیداکار ناوبران وبە کافر ناویان دەرکردووە, وە پێغەمبەر(ﷺ)کوشتاری لەگەڵ ئەنجام دان, ئەوەش بەبەڵگەی ئەو ئایەتانەی کە لە وانەی ڕابردوو وتمان﴿قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُم مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَنْ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَنْ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلا تَتَّقُونَ﴾(يونس آية: ٥٦). وە ئایەتەکانی تریش کە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾ (الزخرف آية: ٨٧) **واتە**:ئەگەر لێیان بپرسی کێ ئێوەی بەدیهێناوە دەڵێن(الله). کەواتە ئەوانە بەڵگەن لەسەر ئەوە کە موشریك و کافرانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)هەر بە موشریك و هاوبەش پەیداکار ناودەبران, لەگەڵ دانپێنانیان بە خوا بەیەککگرتن لە پەروەردگاریدا وە خوێنیان پارێزراو نەبوو کوشتاریان لەگەڵ کرا.

دووەم: بەڵگە چیە لەسەر ئەوەی کافران و هاوبەشپەیداکارانی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)وابوون و خوێنیان پارێزراو نەبوو ؟

وەڵام:بەڵگەمان ئەو ئایەتانەی ڕابردووە, وە لەپاشان بەڵگەمان ئەوەیە ئەگەر ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ)بخوێندرێتەوە و لەفەرموودەکانیشی دەردەکەوێ کە پێغەمبەر(ﷺ)جەنگ و کوشتاری لەگەڵیان بەرپا کردووە خوێنیان پارێزراو نەکردن وهەریەك لەو کافرو هاوبەش پەیداکارانە کوژران بەدەستی بڕواداران کەوا نەهاتن وازبێنن لە (لات و عوززا و بت و صەنەمەکان)و (کوفریان نەکرد بەتاغوت),وە دانیان نەنا بە خوایەتی خوا لە ڕووی پەرستشدا کەهەر ئەو تەنها شایستەی پەرستنە .

سێیەم: چەند پەندو وانە لەو ئایەتە وەردەگیرێ بەکورتی بیژمێرە ؟

وەڵام:چەند فەرمان و پەند و وانەیەکی لێوەردەگیرێ, لەوانە ئەو ئایەتەی خوای گەورە فەرموویەتی ﴿قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَنْ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَنْ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾(یونس آیة: ٥٦). یەکەم ئەوەی لێوەردەگیرێ دانتان بەخوا بەیەککگرتن لەپەروەردگاریەت بەس نییە بۆ بڕوادار بوون,دووەم ئەوەی لێوەردەگیرێ کە دانان بە پەروەردگاریەت بەبێ دانان بە تەنهایی پەرستراوەتی خوا (التوحيد الالوهية) خوا بەیەککگرتن لە پەرستندا و خوایەتی دا خاوەنەکەی لە هاوبەشی و کوفر ڕزگاری نابێت, وە خوێنی پارێزراو نابێت, سێیەم خوا بەیەکگرتن لە پەروەردگاریەت ئەوە دەسەلمێنێ کە خوا تاکە و بەیەك بگیرێ لەپەرستن ئەوە پێویست و واجبە, چوارەم ڕاڤەی (لااله الا الله) ئەوەیە کە هیچ پەرستراوێکی ڕەوا نیە جگە لە (الله),نەك ئەوەیە کە هیچ بەدیهێنەر و بەڕێوبەرێك نیە جگە لە (الله), چونکە موشریك و بێبڕوایان ئاوا بڕوایان هەبوو کە پێشیان دەوترا بلێن (لااله الا الله) وەریان نەدەگرت ڕەتیان دەکردەوە پێی ڕازی نەبوون, پێنجەم ئەوەی لێوەردەگیرێ هاوبەشپەیداکردن لە پەروەردگاری خوا زۆر کەم و دەگمەن بووە لە کۆنەوە ولە نوێش, زۆربەی هاوبەش پەیداکاران لەپەرستن و خوایەتی خوا

هاوبەشیان بۆ خوا پەیدا كردووە  جا ئەوە پرسیارەكانی بنەمای یەكەم  بوو دێینە سەر بنەمای دووەم .

## بنەمای دووەم

الْقاعدَة الثَّانيَة: أَنَّهُم يَقُولُونَ: ما دَعَوْناهُم وَتَوَجَّهْنا إِلَيْهِم إِلّا لطَلَب الْقُرْبَة وَالشَّفَاعَة.
فَالدَّلِيلُ الْقُرْبَة قَوْلُه تعالى:{وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِه أَوْلِيَاء مَا نَعْبُدُهُمْ إِلاَّ لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّه زُلْفَى إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيه يَخْتَلِفُونَ إِنَّ اللَّهَ لايَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ}(الزمر آية: ٣).
وَالدَّلِيلُ الشَّفاعَة قَوْلُه تعالى: {وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّه مَا لا يَضُرُّهُمْ وَلا يَنْفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّه}(يونس آية: ١٨).
وَالشَّفَاعَةُ شَفَاعَتَان: شَفَاعَةٌ مَنْفيَّة، وَشَفَاعَةٌ مُثْبَتَة.
فَالشَّفَاعَةُ الْمَنْفيَّة ما كانَتْ تُطْلَبُ منْ غَيْرِ الله فيما لا يَقْدرُ عَلَيْه إِلّا الله.
وَالدَّلِيلُ قَوْلُه تعالى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ يَوْمٌ لا بَيْعٌ فِيهِ وَلا خُلَّةٌ وَلا شَفَاعَةٌ وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ}(البقرة آية: ٢٥٤).
وَالشَّفَاعَةُ الْمُثْبَتَة هي الَّتي تُطْلَبُ منَ الله، وَالشَّافعُ مُكَرَّمٌ بالشّفاعَة، وَالْمَشْفُوعُ لَهُ مَنْ رَضيَ اللهُ قَوْلَه وَعَمَلَه بَعْدَ الْإِذْن، كَما قَالَ تَعالى: {مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِه}(البقرة آية:٢٥٥).

﴿القاعدة الثانية﴾ بنەمای دووەم لە وانەی پێنجەم كە (شێخ محمدی كوڕ عبدالوهاب)(رحمه الله) بەوەی دەست پێدەكا و دەفەرمووێ﴿أهم يقولون: ما دعوناهم وتوجهنا إليهم إلا لطلب القربة والشفاعة﴾واتە: ئەو كافر موشریكانە دیان وت ئێمە هاناو پاڕانەوەی لەبەر ئەو (بت و صەنەمانە)ناكەین و ڕوویان تێناكەین ئیللا مەبەستمان پێی نزیك بوونەوەیە لە خوای گەورە و تكاكردنە, كە تكامان بۆ بكەن لەلای خوای گەورە,﴿فدليل القربة قوله تعالى﴾ جا بەڵگەی نزیك بوونەوە كە وایان گوتووە فەرموودەی خوای بەرزە ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِه أَوْلِيَاء مَا نَعْبُدُهُمْ إِلاَّ لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّه زُلْفَى إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيه يَخْتَلِفُونَ إِنَّ اللَّهَ لايَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ﴾(الزمر آية: ٣). واتە: دەفەرمووێ ئەوانەی كە بێجگە لە خوای پەروەردگار دۆست و هاوبەشیان پەیدا كردووە و بڕیارداوە دەیان وت ئێمە نایان پەرستین مەگەر بۆ ئەوەی لەخوامان نزیك بكەنەوە, جا بەڕاستی خوا دەفەرمووێ (الله) حوكم و بڕیار دەدا لە نێوانیان كەوا ئەوان تێیدا جیاوازبوون جا بەڕاستی (الله) كەسێك هیدایەت و ڕێنموونی ناكات كە درۆزن بێ, كافرو

بێ بڕوابێ.﴿ودليل الشفاعة قوله تعالى﴾ وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەوان دەیان گووت بۆ ئەوەیە کە تکامان بۆ بکەن لەلای خوای گەورە ئەو (بت و صەنەمانە) دەپەرستین فەرموودەی خوای بەرزە دەفەرمووێ ﴿وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لا يَضُرُّهُمْ وَلا يَنْفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّهِ﴾ (يونس آية: ١٨).

واتە: کافرەکان ئەو (بت و صەنەمانە)یان دەپەرستن بێجگە لە خوای پەروەردگار کە هیچ زەرەرو زیانێکیان لەدەست دانییە وە هیچ سوودو کەڵکێکیشیان پێناگەینێت, وە دەیان گوت ئێمە تەنها بۆ ئەوەمانە ببنە تکاکار بۆمان لەلای خوای گەورە.

لەپاشان (شێخ محمد)(رحمه الله)دەفەرمووێ﴿والشفاعة شفاعتان﴾ تکا و شەفاعەتیش دوو جۆرە ﴿شفاعة منفية وشفاعة مثبتة﴾یەکەم: شەفاعەتی ڕەتکراوە ،دووەم: شەفاعەتی جێگیر.

﴿فالشفاعة المنفية﴾ تکای ڕەتکراوە ﴿ما كانت تطلب من غير الله فيما لا يقدر عليه إلا الله﴾ شەفاعەت و تکای ڕەتکراوە بریتیە لەو شەفاعەت و تکایەی کە بخوازرێ و داوابکرێت لەغەیری خوای گەورە کە خۆی لەخۆیدا دەبێ هەر لە خوای داوا بکرێ لەبەر ئەوەی شتێك داوا دەکرێت کە لە توانای غەیری خوای دانییە ئەوە پێی دەگوترێ تکای ڕەتکراوە, واتە: بێ کەڵکە تکا و شەفاعەتەکە چونکە ئەو کەسەی داوای لێدەکرێ جگە خوای پەروەردگار توانای ئەوەی نیە بەڵکو تەنها لەتوانای (الله) خۆیدایە هەیە ﴿والدليل قوله تعالى﴾وە بەڵگەش فەرموودەی خوای بەرزە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ يَوْمٌ لا بَيْعٌ فِيهِ وَلا خُلَّةٌ وَلا شَفَاعَةٌ وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ (البقرة آية: ٢٥٤). واتە:ئەی گەلی باوەڕداران ئەوانەی بڕواتان هێناوە ببەخشن لەو ڕزق و ڕۆزیەی خوا پێتانی داوە پێش ئەوەی ڕۆژێکتان بەسەردا بێت کڕین و فرۆشتنی تێدا نەبێ وە دۆستایەتی ونزیکایەتی تێدا نەبێ وە تکای تێدا نەبێ, جا کافر و بێبڕوایەکان ستەمکارن و زوڵم دەکەن.

﴿والشفاعة المثبتة﴾ تکای جێگیریش ﴿هي التي تطلب من الله﴾ بریتیە لەو شەفاعەت وتکایەی کە لەخوا داوادەکرێ, ﴿والشافع مكرم بالشفاعة﴾ تکاکار ڕێزی لێگیراوە بەشەفاعەت وتکاکەی کە دەیکا ﴿والمشفوع له من رضي الله قوله وعمله بعد الإذن] ئەوەی تکای بۆ دەکرێ بریتیە لەو کەسەی کە خودای گەورە لەقسەو کرداری ڕازیە دوای ئەوە مۆڵەتی دەدات تاوەکو شەفاعەت

بکات ﴿كما قال تعالى﴾ هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی ﴿مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ﴾ (البقرة آية: ٢٥٥). واتە: کێ هەیە لەتوانایدا هەبێ تکا بکات لەلای خوای گەورە مەگەر ئەوەی خوا مۆڵەتی بدات.

کەواتە لێرە بۆمان دەردەکەوێت ئەوەی تکای لێ دەکرێ و ئەوەی تکا دەکات وئەوەی تکای بۆ دەکرێ سێنە. ڕوکنەکانی تکای جێگیر ئەویش یەکەم :ئەوەی تکای لێدەکرێ (الله). وە دووەم: ئەوەی تکا دەکات بریتین لە پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام) و فریشتەکان و باقی بڕواداران.سێیەم: ئەوەی تکای بۆ دەکرێ کەسێك بێ دەبێ موشریك و کافر نەبێ لە بازنەی ئیسلام و ئیمان و باوەڕ بێ,بەلاّم سێیەم ئەوکاتە تکای بۆ دەکرێت لەدوای ئەوەی خوای گەورە مۆڵەتی دەدات .

جا لە پاشان دێینە سەر ئەوەی کەوا هەڵوێستە بکەین لەسەر ئەو بنەمایەی بەلاّم هەڵوێستەکان زۆری دەوێ زۆر بەکورتی ئەوەیە یەکەم دەبێ ئێمە بزانین ئەو(قاعیدە) و بنەمایە زۆر زۆر گرینگە, لەبەرئەوەی ئێستا لە نێو خۆشماندا هەر لەسەردەمەکەی ئێمەش بەڕاستی زۆر خەڵك هەن دەستیان بەوە گرتیە دەڵێن کاکە خۆ ئێمە ناپەرستین ئێوە پێتان وایە فلاّن گۆڕو فلاّن بەرد و فلاّن بەرنامە و ڕێباز دەپەرستین ئێمەش مسولّمانین و بڕوادارین, پێمان وایە خوا بوونی هەیە خوای پەروەردگار ئێمە دەژێنی وەکو ئێوە, ئێمەش دەڵێن (الله اكبر) دەکەین و بڕوامان وایە مردن و ژیان و ڕزق و ڕۆزی بەدەست (الله) یە, جا بۆچی ئێمە بڕوادار نین ؟بۆچی موشریك وهاوبەش پەیداکارین ؟لەگەڵ ئەوەشدا وەکو موشریك وهاوبەش پەیدا کەرانی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)هەریەکە بەدەیەها شیرك و هاوبەشی دەکات وە بەدەیەها (بت و صەنەم)ی بۆخۆی داناوە دەیپەرستی لەهەواو هەوەسی خۆی ڕا بگرە تاوەکو دەگاتە بەرنامەو ڕێبازو فکرەی وە دەگاتە زۆر جاروەیە مردووەکان و گۆڕو گۆڕستانیش دەپەرستی (پەنا بە الله) جا ئەوە دەردەکەوێ دەڵێن فلاّن کەس پیاوی باش بووە لەلای خوا ڕێزی هەیە دەیکەینە نێوەندگیر لەنێوان خۆمان و خوای پەروەردگار (پەنا بە الله) خۆمان پێ لەخوای نزیك دەکەینەوە با ببنە تکاکارمان لەلای خوای پەروەردگار قەسەکەیان هەروەك و قسەکانی هاوبەش پەیداکەرانی سەردەمی پێغەمبەرە(ﷺ) دەڵێن خۆ ئێمە مەبەستمان نییە ئەو گۆڕە ئەو مردووە ئەو شێخە ئەو بەرنامەیە ئەو فلاّنە شتە ئەو دارە ئەو بەردە ئەو مەرقەدە ئەوانە پەرستراون و

کڕنۆشیان بۆ ببیەین و پیان پەرستین و سەربەخۆن بەڵکو پێمان وایە ئەوانە نێوەندگرن لە نێوان ئێمەو خوای پەروەردگار بۆ ئەوەی پێ لە لەخوای نزیك بینەوەو ببنە تکاکارمان.

## وانەی شەشەم

گەیشتینە وانەی شەشەم لە شەرح وراڤەو لێکدانەوەی (القواعد الاربع) چوار بنەماکەی (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب)(رحمه الله)وەکو تەواوکەر بۆ وانەی پێنجەمی ڕابردوو هەر لەسەر بنەمای دووەم دەمێنینەوە ئەویش وتمان چەند هەڵوەستەیەکی لەسەر دەکەین بەشەرح وراڤەی زیاترەوە, لێرەوە دەستی پێدەکەینەوە گوتمان موشریك و کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)کە (لات و عوززا و مەنات) و دەیەها شتیان دەپەرست وەك (بت و صەنەم) دەیانوت ئێمە خۆ نایانپەرستین پێمان وانیە ئەوانە خوای سەربەخۆن کڕنوشیان بۆ بەرین تەنها پێمان وایە ئەوانە لەخوامان نزیك دەخەنەوە, ئەوانە نێوەندگیرن لە نێوان ئێمەو خوادا ئەوانە تکاو شەفاعەتمان بۆ دەکەن گوتمان هەروەکو لەئاییەتەکەی ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلاَّ لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾(الزمر آية: ٣). واتە:ئەوان پێیان وابوو دەیان گوت ئەوانە تەنها لەخوامان نزیك دەخەنەوە لەبەر ئەوەیە ئێمە ئەو کارو شتانەیان بۆ ئەنجام دەدەین کەپەرستن بووە وە بەدۆستی خۆمانیان دەگرین و خۆمانیان لیّ نزیك دەخەینەوە.

جا لە پاشان باسی ئەوەمان کرد با بزانین و هەڵوەستەی لەسەر ئەوە بکەین ئەصلّ و بنەمای شیرك و هاوبەشی لە جیهاندا لەسەر چییەوە سەری هەڵداوە, جۆرەکانی چۆنەو چۆن پەیدا بووە, کورتە مێژوویەکی کورت و پوخت زۆر گرینگە دەربارەی بزانین.

ئەصڵی شیرك و هاوبەشی لە جیهاندا دەتوانین بڵێین لە دوو ڕووەوە دروست بووە و بەدیهاتووە, یەکەمیان شیرك لەوەوە هات لەسەردەمی ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)کە لە ئایەتەکان دەربارەی ئیبراهیم پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام)دەردەکەوێت ئەوان بڕوایان وابوو کەوا ئەستێرەکان گیان و ڕۆحیانەتیان هەیە ئەو گیان و ڕۆحیانەتەی ئەستێرەکان دێتە بەر شتەکان جا (جنۆکەی شەیتانی) دەهات لەجێی ئەوەی کە ئەوان پێیان وابوو ڕۆحیانەتە قسەو گفتوگۆ وجار وەبوو ئیش و کارو جولەی بۆ دەکردن, ئەوان هەندەی دی لەسەر شیرك و هاوبەشیەکەیان بەردەوام دەبوون دەیان گووت ها ئەوەیە کە ئەو ( بت و صەنەمانەی دەیانپەرستن دەیان ووت ڕووحیانەتی ئەستێرەکانە ئائەوە نیە ئیش و کارمان بۆ دەکەن و وەڵاممان دەدەنەوە, ئەوەتە نییە فلاّن شتەمان بۆ دەکەن هەروەکو خوای گەورە دەربارەی

ئیبراهیم پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام)دەفەرموویێت ﴿وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ * فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَبًا قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَا أُحِبُّ الْآفِلِينَ﴾ (الأنعام آية٧٥-٧٦). جا ئیبراهیم لەو سەردەمیەوە لەسەر ڕای پەسندی زانایان كە جیاوازی لەسەرە ئیبراهیم پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام)مەبەستی ئەوە نەبوو بەخۆی (پەنا بەخوا) موشریك و كافر بووبێ بڕوای وانەبووبێ كە (الله) تاك و تەنهایە خوایە بەدیهێنەرەو ئەو شایستەی پەرستنە بەبێ شیرك و هاوبەشی بەڵكو تەنها وەكو نموونە هێنانەوەیە بۆ ئەوەی بەرچاویان ڕوونتربكاتەوە چاكتر بچێتە ناو دڵ و مێشكیان وە گفتوگۆیەكەی دەستپێبكات هەر لەو پێناوەی بوو كاتێك كە گووتی: ئێوە پێتان وایە ئائەوە پەروەردگارو خواتانە كاتێك كەوا ئەستێرەكەی بینی نەك بۆخۆی ئەوها بیروباوەڕی وابێ ئەوە ڕای پەسەندترە (والله اعلم).

جا لەلایەكی ترەوە شیرك و هاوبەشی قەومی نوح (عليه الصلاة والسلام)هەندێ لەزانایان دەڵێن لەپێش ئەو بووە شیرك و هاوبەشی بووە لە ڕووی بیروباوەڕبوون بە ڕوحانیەتی, بە حساب پیاوچاكان كە ڕووحانیەتی پیاوچاكان لەتوانایدا هەیە دێتەوە بەر بتەكان و یان خۆیانن و ئەو ئیش و كارەی داوایان لێدەكرێ بۆیان دەكەن و یارمەتیان دەدەن دەبنە نێوەندگیر لەنێوان خۆیان و خوادا یان تكایان بۆ دەكەن, ئەوەتا خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێ ﴿وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾ (نوح آية: ٢٣).واتە:دەیانووت وازمەهێنن لە پەرستراوەكانتان ئێوە وازمەهێنن لە ( وەدد وسواع و یەغوپ و یەعوق و نەسر) .جا ئەوە جێگیر بووە ئەو ناوانە و ئەو وشانە بە مانای چی دێ, لە صحیح بوخاری لەو فەرموودەیەی كە( عطاء) ئەویش لە (عبدالله ی كوڕی عباس)(رضي الله عنهم)گێڕایتیەوە ئەویش فەرموویەتی ((هَذِهِ أَسْمَاءُ رَجُلٍ صَالِحِيْنَ كَانَ فِي قَوْمِ نُوْحٍ وَوَقَعَ الشِّرْكُ بِهَؤُلَاءِ الرِّجَالِ لِأَنَّهُمْ صَالِحوْن))جا ئەوە لە صحیح بوخاری لە باس و بابەتی (تفسير القران) لەتەفسیری فەرموودەی خوای ﴿وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾ (نوح آية: ٢٣) بە ژمارە (٤٩٢٠) هاتووە.جا فەرموویەتی (ابن عباس)(رضي الله عنهما)ئا ئەوانە ناون واتە ( وەدد وسواع و یەغوث و یەعوق و نەسر) ئەوانە ناوی پیاوانی چاكی قەوم وگەلی نوح بوون, كەشیرك و هاوبەشی هاتە ناویان

بەهۆی ئەو ناوانەوە, چونکە ئەوان پیاوچاك بوون لەپاش ئەوەی کە مردن هەیکەلیان بۆ داتاشین ئەوجا قەبرو گۆڕەکانیان بۆ ڕازاندەوە ئەوجا دەچوون لەکۆتایی چەند ماوەیەك لە نەوەکانیان گەیشتنە سەر ئەوەی کوڕنوشیان بۆ بەرن بیانپەرستن وە شێوازی (بت و صەنەم) لەسەر وێنەکانیان دروست بکەن.

جا شیرك و هاوبەشی لەو دوو ڕوویەوە دونیای داگرت و هەیەو هەبووە ئێستاش هەر بەردەوامە جا عەرەبەکانیش شیرك و هاوبەشی زیاتر بە حیساب ڕوحیانەتی پیاوچاکەکان و بەدەردی قەومی نوح (عليه الصلاة والسلام)چوون وە هی ئەوانەی پاش ئەوان کردییان (بت و صەنەمەکانیان) داڕشت کاتێ کە ئەوانیش هاتن بۆ ناو قەومی عەرەبەکان کەوا (بت و صەنەمیان ) هاتە ناو و لەوانە(لات و عوززا و مەنات ...هتد)دەپەرستران, بۆ نموونە (لات) ئەو بتە بووە کە پەرستراوە هەندێك دەڵێن پیاو چاکێك بووە کە(ابن عباس)(رضي الله عنهما) یەکێك بووە لەوان دەڵێت (لات) پیاو چاکێك بووە کاتێك کەوا ئیش و کارەکەی بریتی بوو لەوەی کە گەنمی دەهێنا و دەیهاڕی و یان ئاردی کەپەکی لێ دروست دەکرد و ئەوجا لەگەڵ ئاوی تێکەڵ یەکی دەکردوو پاشان بەسەر بەردێکی کە ئەوهاڕینەی دەکرد بەکاری دەهێنا, ئەو خەڵکەی کەوا بۆ حەج دەهاتن پێی دەبەخشین و پێی دەدان, کاتێك کە ئەو کەسە مرد کەبەردەکە لەو شوێنەی دا مابۆوە بەگەورەیان گرت و ڕێزیان لێگرت وتیان ئەو بەردە هی ئەو کەسە بووە کەوا وای بۆمان دەکردوو گەنمەکانی دەهاڕی و یارمەتی ئەوانەی دەدا کە دەهاتن حەجی ماڵی خوای پەروەردگاریان دەکرد, ئەوەبوو ئەو پیاوە (سەقەفیەکان)ئەو بەردەیان پەرست و وە ئەو پیاوەش وا ماوە کە بپەرسترێ جا پێیان وابوو پیاوێکی باشە جا لە کۆتاییەکەیدا پەرسترا.

وە (عوززا)ش ئەو بتە بوو هاتە ناو عەرەبەکانی ئەهلی مەککە پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ)بڕوایان وابوو(پەنا بەالله)کەئەوە کچی خوایە (پەنا بەخوا) دەیانپەرست و عیبادەتیان بۆ دەکرد, وە پێیان وابوو زۆر بەتوانایە لەشەڕو جەنگەکان ئەو بتەی(عوززا)یان دەبردوو بەکاریان دەهێنا و دەیانگووت سەرمان دەخات وە ئێمە (عوززا)مان هەیە, ئەوە بوو کاتێك (ئەبو سوفیان) لە جەنگی (ئوحود) وای کردوو هاواری کرد ئێمە (عوززا) مان هەیە ئێوە نیتانە ئەوە (عوززا) بزانە چی بەسەر هێنان, پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی ئەی هاوەڵان وەڵامی بدەنەوە پێی بڵێن ئێمەش خوامان هەیە پشتگیری کارمانە و دۆستمانە ئێوە نیتانە لەگەڵ ئێوەدا نییە, ئەوەبوو

جا (خالیدی كوڕی وەلید)(رضي الله عنه)لەگەڵ مەفرەزەیەكی (سی) كەسی ڕۆیشت بەرەو ئەوەی كە فەتحی مەككەی كرا لەڕێگاكەی (عوززا)ی لەناو ببات, و ئەوەبوو كافرو موشریكەكان كۆبوونەوە وتیان نەكەی (خالید) وات بەسەر دێ و وات لەگەڵ دەكات (عوززا) زۆر بەتوانایە, (خالیدی كوڕی وەلید) یش (رضي الله عنه)پاڵەوانانە كە خوای بەیەك دەزانی وە ئەهلی تەوحید بوو، بەئەمری پێغەمبەری(علیه الصلاة والسلام)چوو لەدەوروبەری سوڕاوەو وەكو ئەو شیعرو هۆندراوەیەی هەیە گوتی (یَا عوزَّا كُفْرانَك لَا سُبْحَانَك:إِنِّي رَأَيتُ اللهَ قَدْ أَهَانَك)واتە: ئەی (عوززا) من بەتۆوە كافرم بەپاك و بێگەردت نازانم, بەڵكو من خوام بینی تۆی بێ ڕێز كرد و ڕیسوای كردی جا (خالیدی كوڕی وەلید) (رضي الله عنه)بینی وای لە (عوززا) كرد ئافرەتێكی پرچ بە گروازەی كە پرچی زۆر بوو كە ئەو جنۆكە شەیتانییە بووە خۆی لەناو ئەو بتەی نایە هەمووجار وەڵامی ئەوانی دەداوە لەناو بتەكە هاتە دەرو خالیدی كوڕی وەلید(رضي الله عنه)كوشتی, كەئەوەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ)گێڕایەوە پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی ئەوە (عوززا) بوو لەدەستیان ڕۆیشت و نەما, (عوززا) جارێكی تر بۆیان ناگەڕێتەوە لە (البدایه والنهایه ابن كپیر) لەبەرگی چوارەم لەلاپەڕە(٣٦٢)ئەو ڕیوایەتە گێڕدرایەتەوە كە ئێمە بەكورتی باسمان كرد ئەوە لە ساڵی (٨)ی كۆچی لە(٢٥)ی ڕەمەزان كاتێك پێغەمبەر(ﷺ)خالیدی نارد لەناوی برد.

وە(مەنات) یان هەبوو دەیانپەرست (پەنا بەخوا) كە هەندێك دەڵێن لەناوی خوای گەورە (المنان) وەریانگرتبوو, دەیانگوت ئەوە مەناتە هەندێكیان دەیان وت ئەوەندە خوێنیان بۆ دەڕشت بەسەریاندا دەكرد لەو قوربانیانەی كە بۆ ئەو بتەیان سەردەبڕی دەیان وت ئەو بە پیت وبەرەكەتە, لەوەیەوە ناوی (مەنات)ی لێندرابوو چونكە لە عەرەبی كە دەوترێ (يُمْنَا عَلَيْهَا مِنَ الدِّمَاءِ)كە خوێنی زۆریان بەسەر ڕێشتبوو كە هەندێك دەڵێن پێغەمبەر(ﷺ)(ئەبو سوفیان) (رضي الله عنه)ی نارد لەدوای ئەوەی كە فەتحی مەككەی كرد ئەو(مەنات)ی لەناو برد و تێكی شكاندوو هەندێكیش دەڵێن (عەلی كوڕی ئەبو طالیب)(رضي الله عنه)بوو لە سیرەی (ابن هشام) ئەمە باسكراوە, گرینگ ئەوەیە ئاوا بت پەرستی هاتە ناو عەرەبەكانیش (پەنا بەخوا) بت پەرستیەكە پەرەی سەندو تا ئێستاش لە نێو ئێمەدا دووبارە زیندوو بۆتەوە بت پەرستیەكی یەكجار زۆر هەیە و لەسەردەمی (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب)یش(رحمه الله)هەر وابوو هەر بۆیە ئەو نامیلكەو نوسراوانەی نووسی وەڵامی پێدانەوە هەڵوەستەیەكی تر ئەوەیە كەوا لەسەر

شەفاعەت و تکا بیکەین لەو بنەمای دووەم کە (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله) هینایتی کە بزانین شەفاعەت و تکاکردن چەندە گرینگە ئەوجا پێناسەکانیان بکەین وە بەڵگەکانیان بۆ بهێنینەوە (ان شاء الله) لەوانەی داهاتوو بە پشتیوانی (الله) باسی دەکەین.

## وانەی حەوتەم

گەیشتینە سەر دەرس و وانەی حەوتەم كە هەڵوەستە دەكەین لەسەر بنەمای دووەم (القاعدة الثانية) كە دێینە سەر باسی تكا و شەفاعەت لە قورئان و فەرمووده, با بزانین جۆرەكانی چین وە تۆزێك لەسەری دەڕۆین وە ڕوونكردنەوەی لەسەردەدەین, چونكەلەسەردەمی خۆشمان تكا و شەفاعەت بۆتە بیانوویێك (پەنا بە الله) جار هەیە شیرك و هاوبەشی لێ ڕوودەدات جار هەیە گوناه و تاوانی پێدەكرێت یان خەڵكانێك هەن لێی كەمتەر خەمن و كەم و كورتن تێیدا وە بڕوایان بەهەندێك لەبەشەكان نییە كە جێگیرە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری دڵسۆز(ﷺ),وە هەشیانە تێپەڕی دەكات و شەفاعەت وتكای دەداتە دەست كەسان و خەڵكان و بت و صەنەمێكی بۆی بڕیار دەدات كە هیچ شەفاعەت و تكایان بۆ نییە.

جا لەو پێناوەی دەڵێین شەفاعەت و تكا بزانین ماناكەی چییە لەسەرەتا لە زمانەوانیەوە پێناسەی دەكەین, وە لە پاشان دەچینە سەر ئەوەی كە بەڵگەكان لەسەری دەهێنینەوە وە بەئایەتەكانی قورئان و جۆرو بەشەكانی, پاشان ئەو مەرجانەی كە شەفاعەت و تكای لەلایەن ئەهلی سوننەو جەماعە بۆ خەڵكانێك لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)و فریشتەكان و لە پیاو چاكان داناوە ئایا چییە ئەو كات بۆمان ڕوون دەبێتەوە بەتەواوەتی.

سەرەتا دەڵێین(الشفاعه) شەفاعەت بەكوردییەكەی بە مانای ئەوەی دێت پرسیارو داواكردن بۆ لێخۆشبوون و بوورین لەتاوان وگوناه, كە كەسێك بۆ كەسێك بیكات لەلای دەسەڵات دارێك, ئەو دەسەڵاتدارەش سەبارەت بە قیامەت بێت مەبەست پێی(الله)یە , سەبارەت بە دونیا جار وەیە مەبەست پێی دەسەڵاتداری دونیا وحاكم و دەسەڵاتداریشە, وشەكە لە(شَفَعَ يَشْفَعُ شَفَاعَةً) هاتووە واتە تكای كرد وە تكادەكات وە تكاكاری( شَافِعْ)بەو كەسەی دەگوترێ كە تكاكارە (شَفِيع) یش بەو كەسە دەگوترێ دیسان تكاكارە لەسەر وەزنی(فعيل) بەمانای (فاعل) وە (مُشَفِّعْ)بەو كەسە دەگوترێ واتە تكاوەرگر مەبەست پێی (الله)یە بۆ شەفاعەت و تكاكانی تایبەت بە خوای, وە (مُشَفَّع) مەبەست پێی ئەوەیە ئەو كەسەی كەوا تكای لێوەردەگیرێ وە كۆیەكەی(جمع)ەكەی (الشُّفَعَاء) وەلە ئەسەروفەرموودە هاتووە ئەم وشە هەم لە قورئانی پیرۆز وە یەك لە ئەسەرەكان وە لە حەدیسەكان كە كۆمەڵێك لە موحەددیسین دەڵێن مەوقوفە

لەسەر زوبەیری کوڕی عەوام(رضي الله عنه)کە گوتویەتی ( إِذَا بَلَغَ الْحَدُّ السُّلْطَانَ فَلَعَنَ اللهُ الشَّافِعَ وَالْمُشَفِّعَ)واتە: ئەگەر هاتوو سنورە شەرعییەکان بەزێندران حەددێکی شەرعی جێگیر بوو لەسەر کەسێکی گەیشتە دەسەڵاتداری واتە گەیشتەحاکمی شەرعی ئەو کەسە کەسێك بچێ تکای بۆ بکات تاوەکو حەددە شەرعییەکەی لەسەر جێگیر نەبێت (شافع)ەکە تکاکارە وە (مشفع) ەکە ئەوەی تکای بۆ دەکات تکا وەردەگرێت لەلای ئەو کەسانەوە ئەوانە هەردووکیان ئەو کەسانە بەر نەعلەتی خوای گەورە دەکەوێت وە نەفرین و نەعلەتی خوای دەیگرێتەوە, دوعای ئەوەی لێکراوە کەوا مەبەستمان ئەوە بوو وشەی (الشَّافِعِ ،وَالْمُشَفِّعِ) هاتووە لە ئەسەرەکانیش.

لەپاشان ( ابن مسعود) (رضي الله عنه)ڕیوایەتێك دەربارەی قورئان ئەویش مەوقوفە لەسەر( ابن مسعود) (رضي الله عنه)هەندێکیش دەڵێن لە ڕێگای (جابر)ی(رضي الله عنه) مەرفوعە کە وتراوە(الْقُرْآن شَافِعٌ مُشَفَّعٌ وَمَاحِلٌ مُصَدَّق)واتە: قورئان هەم تکاکارە وەهەم تکاوەرگریشە وە (ماحل)یشە واتە دیفاع کارەو و بەرگری کارە وە بەڕاست دانراویشە وە بۆ کەسێکیش قورئان بخوێنێت لێی تێبگات و ئیشیشی پێبکات, کەواتە بۆمان ڕوون بۆوە کە شەفاعەت وتکا بەمانای نێوەندو تکاکردن دێت بەچەند مەرجێکەوە ئینجا شەرعی دەبێت لەڕوانگەی ئەهلی سوننەو جەماعە کە کەسێك تکای بۆ بکرێت لەلای خوای پەروەردگار گوناهباربێت یان بۆ پلەی بەرز ببێتەوە ئەو تکاکارانەش لە عەقیدەی سوننەو جەماعە بریتین لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و فریشتەکان وە تێکڕای بڕواداران لەوانە پیاو چاکان لە پێشترن و شەهیدەکان ئەوانەی لە جەنگ و دژایەتی کافرەکان دەکوژرێن خودا بەشەهید قبوڵیان بکات, جا هەیە مانگی ڕەمەزان و ڕۆژی و عیبادەتەکان یان قورئان ئەوانەش دەبنە تکاکار.

جا ئێستا بێین ئایەتەکان بخوێنینەوە لەسەر ئەوەی چونکە تکا لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە دوو بەشی سەرەکییە وەکو (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب)(رحمه الله) لە بنەمای دووەم هێنایتیەوە ﴿الشفاعة المنفية﴾ واتە: تکای ڕەتکراوە،﴿الشفاعة المثبتة﴾واتە: تکای جێگیر, ﴿الشفاعة المنفية﴾ خودای گەورە لەقورئان هەندێك لەشەفاعەتکاران هەندێك لەشەفاعەتەکانی ڕەتکردۆتەوە ئەو ئایەتانە دەیگرێتەوە وەکو خوای گەورە دەفەرموویێت﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا لَا تَجْزِي نَفْسٌ عَنْ نَفْسٍ شَيْئًا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَاعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنْصَرُونَ﴾ (البقرة آية: ٤٨).

واتە: لەو ڕۆژەی پارێزکار بن و لە خوا بترسن کە هیچ کەسێك بۆ کەسێك شتێکی پێناکرێت وە شەفاعەت و تکایەکەی وەرناگیرێت, وە هیچ کەسێك لەبری کەسێکی تر فیدیە لە جیاتی ئەو وەرناگیرێت کە ئەو عەزاب نەدرێت شێك لە جیاتی ئەو عەزاب نەدانە وەربگیرێت وە ئەوان سەرکەوتوو نابن سەرناخرێن, کەواتە لێرە خوای گەورە تکای ڕەتکردەوە چونکە ئەو شەفاعەت وتکایە لە قیامەتێ بەوەیە کە مەرجە شەرعیەکانی لێنەهاتۆتە جێ ،یان دەفەرموویت﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ يَوْمٌ لَا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَاعَةٌ وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾(البقرة آية: ٢٥٤).

واتە: ئەی گەلی باوەڕداران ببەخشن لەوەی کە خوای گەورە بە ڕزق و ڕۆزی بە ئێوەی داوە پێشی ئەوەی ڕۆژێکتان بەسەر دابێ کە لەو ڕۆژەیدا نەکڕین وفرۆشتن هەیە نە دۆست وبرادەرایەتی هەیە ونەتکا و شەفاعەت هەیە وە کافران بێگومان زاڵم و ستەمکارن. لە پاشان خوای پەروەردگار فەرموویەتی ﴿أَأَتَّخِذُ مِنْ دُونِهِ آلِهَةً إِنْ يُرِدْنِ الرَّحْمَنُ بِضُرٍّ لَا تُغْنِ عَنِّي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا وَلَا يُنْقِذُونِ﴾(يس آية: ٢٣).

ئەو ئایەتانە هەمووی ئەوەی گەیاند کە شەفاعەت و تکا ئەگەر مەرجە شەرعیەکانی لێنەهاتبێتەجێ ئەوە ڕەتکراوەیە خودای پەروەردگار قبوڵی نییە ئەوە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە جار هەیە شەفاعەت(المنفية) ڕەتکراوەیە وەك (شێخ محمد بن عبدالوهاب) (رحمه الله) فەرمووی.

تکاکاران جار هەیە حسابیان بۆ ناکرێ چونکە تکاکەیان لە جێی خۆی نییە هەروەکو خوای پەروەردگار فەرموویەتی ﴿وَأَنْذِرْ بِهِ الَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْ يُحْشَرُوا إِلَى رَبِّهِمْ لَيْسَ لَهُمْ مِنْ دُونِهِ وَلِيٌّ وَلَا شَفِيعٌ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾(الأنعام آية: ٥١).

واتە: ئائەوانە کافر یان بێبڕوان یان گوناهکارن بیانترسێنە کە ئەوانەحیساب دەکەن کە پێیان وایە تکاکاریان هەبێ لە قیامەت کە خوای گەورە دەفەرموێت نە دۆست و پشتگیری کاریان هەیە نە تکاکاریان هەیە جا لە ئێستاوە لەخوا بترسن و پارێزکار بن وە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا یان خوای گەورە دەفەرموێت﴿وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنْفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّهِ﴾ (يونس آية: ١٨).

ئەوانە موشريك و كافرو هاوبەش پەيداكەران  بێجگە لە خواى دەپەرستن ئائەوانەى دەيپەرستن لە بت هيچ زەرەرو سوودێكيان ناتوانن پێيان بگەيەنێت يان لەسەريان لادەن ويان هيچ  سوودو كەڵكيان يان لێيان قەدەغە بكەن جا ئەوانە بە ئومێدى ئەوەى دەڵێن ئەوانە تكاكارمانن لەلاى خواى گەورە .وە خواى گەورە دەفەرموێ﴿قُلْ أَتُنَبِّئُونَ اللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (يونس آية: ١٨).

ئايا ئێوە ئەى كافرو موشريكەكان شتێكى دەڵێن كە خواى گەورە نەيزانيبێت (پەنا بەخواى گەورە)  وە خواى گەورە ڕوونى كردۆتەوە وزانيتى وەناتوانن شتێك بكەن خواى گەورە بڵێن ئاگادارنيە پێ ئاگادار نابێت  بەڵكو خواى پەروەردگار بەهەمووى ئاگادارە  بەوەى لە ئاسمان و لە زەوييە پاك و بێگەردى و بەرزى بۆ ئەو خوايەى لەو شيرك و هاوبەشيە بۆى بڕيار دەدەن بەنيازو ئومێدى ئەوەى تكايان بۆ بكەن لەلاى خواى پەروەردگار.

جا هاتووە لەوانە پێشەوا (ابن جرير) لەتەفسيرى ئەو ئايەتەيدا فەرموويەتى ئەوە ماناى ئەوەيە ئێوە ئەوانەى لە ئاسمانەكان و لەزەوييە ئەو پەرستراوانەى دەيپەرستن  پێتان وايە كە دەيكەنە شەريك و هاوبەش  لەگەڵ خواى پەروەردگار لە ئاسمانەكان و لەزەوى دەستيان هەيە و توانايان هەيە سبەى لە مەيدانى حەشرو حيساب  لەلاى خواى گەورە تكاتان بۆ بكات كە ئێوە وا دەزانن ئەوانە تكاكارن   جا خواى پەروەردگار بە پێغەمبەرى (ﷺ)فەرمووە تۆ هەواڵيان پێبدە كە بەهەڵەدا چوونە وە بيروباوەڕەكەيان پوچەڵە وە ئەوانە نە دەتوانن زەرەرو زيانيان پێ بگەيەنن نە دەتوانن سوودو قازانجيان پێبگەيەنن نە بە دڵنياييەوە هيچيان لەدەست نييە كە ئەوان دەيپەرستن تەنها بيروبۆچونێكى پوچەڵە بەڵكو ڕێزێكيان لەلاى خواى گەورە نييە وە خواى گەورە شەفاعەت و تكايان لێ وەرناگيرێ.

لەپاشان خواى گەورە لەئايەتى تر فەرموويەتى﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ مَا لَكُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا شَفِيعٍ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ﴾ (السجدة آية: ٤).

واتە:ئەو (الله) يەى كە وا ئاسمانەكان و زەوى بەدەست هێناوە وە ئەوەى لە نێوانياندايە لەماوەى شەش ڕۆژ لەپاشان بەرز بۆيەوە بۆ سەر(عرش) كەى بارەگاكەى جا ئێوە جگە لە خواى گەورە هيچ كەسێكى تر نييە بتوانێت پشتگيرى كارتان بێت  وەسەرتان بخەن يان

تكاكارتان بێت وە تكاتان وەربگرێت, ئەوجا لەپاشان بۆچی بیرناكەنەوە ئاگادارنابن جا لەپاشان خوای گەورە لەو ئایەتانە تكای تكاكاران كە مەرجە شەرعییە كانی تێدا نییە هەر هەمووی ڕەت كردەوە.

لەبەرامبەریشدا خودای گەورە تكای جێگیر كە (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله) گوتی كەرجۆری دووەم لە ڕوانگەی ئەهلی سوننە و جەماعە جێگیرە ئەو ئایەتانە بەڵگەنە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾ (البقرة آية: ٢٥٥)

كێ هەیە لەلای خوای گەورە تكاكارتان بێت مەگەر بە مۆڵەتی خوای واتە بەمۆڵەتی خوا تكاكار هەیە ئەو ئەو جێگیر دەكات،وە خوای پەروەردگار فەرموویەتی ﴿مَا مِنْ شَفِيعٍ إِلَّا مِنْ بَعْدِ إِذْنِهِ﴾ (يونس آية: ٣).

هیچ كەس تكاكار نیە لە مەیدانی حەشرو حیساب لەلای خوای پەروەردگار ئیللا لە دوای مۆڵەتی خوای دەبێتە تكاكار, یان خوای گەورە فەرموویەتی﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَلْ عِبَادٌ مُكْرَمُونَ﴾ (الأنبياء آية: ٢٦).

واتە:ئەوان دەڵێن خوای (رحمان) منداڵی گرتووە بۆ خۆی هەیەتی پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە بۆ ئەو قسانەی ئەوان دەیكەن بەڵكو ئەوان بەندەی بەڕێزو ڕێزلێگیراون لەلای خوا گەورە كە فریشتەكانن . ﴿لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُمْ بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ﴾(الأنبياء آية: ٢٧).

واتە:ئەوان پێش ئەمڕۆ فەرمانی خوای گەورە ناكەون ئەوان جێبەجێكارن و كاردەكەن بەفەرمان و ئەمرەكانی پێیان دەكرێت لەلای خوای گەورە .﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى وَهُمْ مِنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ﴾ (الأنبياء آية: ٢٨).

واتە: مەبەست پێ ئەوەیە ئەوانەی خوای گەورە پێی عالم وزانایە ئەوە لە پێش و پاش دێت وە ئەوان تكا ناكەن و تكاكارنین ئیللا ئەوانە تكاكارن كە خوای گەورە لێیان ڕازییە .ئەوان زۆر لە خوای پەروەردگار دەترسن جا كەوابی بۆمان دەركەوت لە ئایەتانە كەسێك دەتوانێ تكابكات كە خوای گەورە مۆڵەتی پێبدات, كەواتە مەرجی یەكەم لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوەیە كەوا كەكەسە تكاكارەكە دەبێت توانای تكاكردنەی هەبێت لەپاشان دەبێت مسوڵمان بێت ئەوەی تكای بۆ دەكرێت وەپاشان دەبێت تكاكارەكە مۆڵتی وەرگرتبێت لەلای خوای گەورە ئینجا خوای گەورە پێی ڕازیبێت لەو كەسەی كە تكای بۆ دەكرێت وەكو دەفەرموێت ﴿وَكَمْ مِنْ

مَلَك فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِنْ بَعْدِ أَنْ يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَرْضَى﴾(النجم آية: ٢٦). یان دەفەرمووێ ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى﴾(الأنبياء آية: ٢٨).

ئەوە ئەو مەرجانە دەسەلمێنی ودەگەیەنێ کە خوای پەروەردگار دەبێ ڕازی بێ لەو کەسەی کە تکای بۆ دەکرێ وە دەبێ مۆڵەت بدا بۆ ئەو کەسەش کەوا تکاکارەو لێی ڕازی بێ وە پاشان دەبێ ئەو کەسەی تکای بۆ دەکرێ دەبێ مسوڵمان بێ وە ئەو کەسەی کە تکاش دەکا دەبێ لە دەسەڵاتی دابێ خوای پەروەردگار ئەو توانایەی پێبەخشیبێ.

## وانەی هەشتەم

لە وانەی هەشتەم لە شەرح کردنی چوار بنەماکەی (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب)(رحمه الله)گەیشتینە سەر ئەوەی کۆتا وانە لە قاعیدە و بنەمای دووەم, لەم وانەیان لەگەڵ پرسیارەکانی بە پشتیوانی خوای پەروەردگار دەخەینە بەردەمتان, جا لێرەدا ئێمە لەوانە و دەرسی ڕابردوو پێناسەی شەفاعەت وتکامان کرد وە گوتمان دوو جۆرە لە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە شەفاعەی (منفیە) ڕەتکراوە کە ئایەتەکانمان بە بەڵگە بۆ هێناوە, وە شەفاعەی (مپبتە) جێگیر ئەویش کە ئایەتەکانمان بە بەڵگە بۆ هێناوە, گوتمان تکاکاریش ئەوەی تکاکەی دەکا چەند مەرجێکی بۆ داندراوە و هەڵێنجراوە لە ئایەتەکان و فەرموودەکانی پێغەمبەری(ﷺ), کە مەرجی ئەوەی ئەو لە توانای دابێ تکاکە بکا وە لە پاشان کە مۆڵەتی وەرگرتبێ لەلای خودا,خودا مۆڵەتی پێ دابێ کە تکاکە بکا لە خۆشی ڕازی بێ وە لە پاشاندا ئەوەی تکاکەی بۆ دەکرێ موسوڵمان بێ وە خودا لێی ڕازی بێ, تەنها لێرەدا ئیستسنا هەن ڕەنگە بگوترێ ئەدی بۆچی تکا کرا بۆ (ئەبو تاڵیب)ی مامی پێغەمبەری (ﷺ)تکاکەش وەرگیرا, ئێمە دەڵێین ئەوە ئیستسنائە خودای پەروەردگار تەنها ئەوەی قەبوڵ کردیە ئەویش کە (ئەبو تاڵیب) چەند چاکەی دونیەوی هەبوو لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ),کە پێغەمبەر (ﷺ)تکاکەی کرد خودای پەروەردگار ئەوەی لێ وەرگرت عەزابەکەی پێ خەفیفتر کرد بەس پێ نەهاتە دەرێ لە ئاگری دۆزەخ, کەواتە ئەوە ئیستیسنایە و حاڵەتێکی دیاری کراوە و یەکجار ڕویدایە و جارێکی تر بۆ کافر و بێبڕوایان تکا لە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەی وەرناگیرێ وە قەبوڵ نیە.

ئەوانی تکاکارن گوتمان جار وەیە فریشتەنە وەکو بە ئایەت و بەڵگە گوتمان وە جار وەیە پێغەمبەرانن (عليهم الصلاة والسلام)وە جاریش وایە پیاوچاکانن و شەهیدەکانن وە جار وایە قورئان تکاکارە وە جار وایە ڕۆژی و عیبادەتەکانە, ئەوانە هەر هەموویان لە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە دەتوانن تکا بکەن بۆ کەسێکی یان پلەی بەرزتر ببێتەوە لە بەهەشت یان لە ئاگری دۆزەخ دەربچێ یان عەزابەکەی پێ کەم ببێتەوە بەو مەرجانەی ڕابردوو کە گوتمان.

جا لە پاشان با بزانین پێغەمبەر (ﷺ)چەند شەفاعەت و تکای هەیە زۆر بە کورتی و پوختی پێغەمبەری خوا (ﷺ)بەڵگە لەسەر ئەوەی شەفاعەت بۆ وی جێگیرە یەك لەوان ئەو بەڵگەیە کە

(شفاعه العُقْمى) ی بۆ هەیە, پێغەمبەر (ﷺ)لە فەرموودەی صەحیح دا هاتووە واتا (تکای مەزن)ی بۆ هەیە لە مەیدانی حەشر و حیساب کە خەڵکەکە ڕادەگیرێ, پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)ئەو پلە و پایەی پێ دەبەخشرێ کە لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە کە ئەبو هوڕەیرە (رضي الله عنه)دەگێڕیتەوە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ)کاتێك کەوا فەرموویەتی ((أَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)) من گەورە و مەزنی خەڵك و مەردوومم لە ڕۆژی دوایی ((وَهَلْ تَدْرُون مِمَّ ذَلكَ؟))فەرمووی ئایا دەزانن ئەوەش چۆنە و چیە ((يَجْمَعُ اللهُ النَّاسَ الْأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ فِي صَعِيد وَاحد،يُسْمعُهُمُ الدَّاعِي وَينفذُهُمُ الْبَصَر، وَتَدنُوا الشَّمْسُ،فَيَبْلُغُ النَّاسَ مِنَ الغمِّ وَالْكَرْب مَالَا يُطِيقُونَ وَلَا يَحْتَمِلُونَ،فَيَقُولُ النَّاسُ: أَلَا تَرَونَ مَا قَدْ بَلَغَكُم،أَلَا تَنْظُرُونَ مَنْ يَشْفَعُ لَكُمْ إِلى رَبِّكُم؟ فَيَقُولُ بَعْضُ النَّاسِ لِبَعْضٍ:عَلَيكُمْ بِآدَم، فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ لَهُ : أَنْتَ أَبُو الْبَشَرِ،خَلَقَكَ اللهُ بِيَدِه،وَنَفَخَ فِيْكَ مِنْ رُوحِه،وَأَمَرَ الْمَلَائِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ،إِشْفَعْ لَنَا إِلى رَبِّكَ،أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيْه؟أَلَا تَرى إِلَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ آدَم: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ ،وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ ،وَإِنَّهُ قَدْ نَهَانِي عَنِ الشَّجَرَةِ فَعَصَيْتُهُ، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي إِذْهَبُوا إِلى غَيْرِي، إِذْهَبُوا إِلَى نُوحٍ)).

پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی ئا لەو ڕۆژەی مەیدانی حەشر و حیساب کە لە یەکەمەکانەوە تا کۆتا مەردووم وخەڵکی کۆدەکرێنەوە لە یەك دۆڵیدا لە یەك مەیدانیدا, لەپاشان فەرمووی ئەو کاتی وای لێ دێ کە چاوەکان بێ هێز دەبن وە ڕۆژ و هەتاو و خۆر لەسەریان نزیك دەبێتەوە, خەڵکی لە غەم و پەژارە و دڵتەنگی وایان لێ دێ کەوا هێزیان نامێنێ چی دی تەحەمول ناکەن, وە لە پاشان خەڵکی بەیەکتری دەڵێن ئایا نابینن ئای ئێمە بە چ گەیشتین چیمان بەسەر هات بۆچی ناگەڕێین لە دوای کەسێکی کەوا تکامان بۆ بکات لەلای خوای پەروەردگارمان, هەندێکیان بە هەندێکیان دەڵێن بچینە لای ئادەم (علیه السلام)باشە, جا دێنە لای ئادەم و پێی دەڵێن ئەی ئادەم(علیه السلام) تۆ باوکی مرۆڤایەتی خوای گەورە بەدەستی خۆی تۆی بەدیهێناوە وە ڕۆحی بە تۆ بەخشیوە و دروستی کردووە و وەبەر تۆی ناوە, وە مەلائیکەت وفریشتەکانی فەرمان پێ کرد کڕنوشت بۆ بەرن ڕێزت لێ بگرن, تۆ تکاکار بەلەلای پەروەردگارت بۆ ئێمە, نابینی ئێمە لە چ داین نابینی ئێمە گەیشتینە چ ئاستێکی, ئادەمیش(علیه السلام) پێیان دەڵێ بەڕاستی پەروەردگارم ئەمڕۆ توڕەبوونێکی گرتووەو غەزەبێکی گرتووە ئەو غەزەب و توڕەبوونەی لە

پێشتردا نموونەی نەبووە وە لەمەودواش نموونەی نابێت, جا ئەو قەدەغەی منی كرد من لە بەری دارەكە بخۆم لە بەری دارەكەم خواردوو سەرپێچی فەرمانیم كرد, من ئەوڕۆ هەرخۆم هەرخۆم هەرخۆم بڕۆنە لای یەكێكی تر بڕۆنە لای نوح (علیه السلام) .

((فَيَأْتُونَ نُوحاً فَيَقُولُونَ : يَا نُوحُ، إِنَّكَ أَنْتَ الأَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى أَهْلِ الْأَرْضِ، وَقَدْ سَمَّاكَ اللهُ عَبْداً شَكُوراً، إِشْفَعْ لَنَا إِلى رَبِّكَ،أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: إِنَّ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ ،وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ قَدْ كَانَتْ لِي دَعْوَةً دَعَوْتُهَا عَلَى قَوْمِي، نَفْسَي نَفْسِي نَفْسِي إِذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، إِذْهَبُوا إِلى إِبْرَاهِيمَ)) كاتێك دەچنە لای نوحیش پێی دەڵێن ئەی نوح تۆ یەكەم ڕەوانەكراو ڕەوسولی لە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە, یەكەم ڕەسول كێ بووە نوح بووە ڕەئی ڕاجیح و پەسەند بە بەڵگەی ئەوەی و چەن بەڵگەیەكی تریش هەیە بەڵام ئادەم نەبی بووە ڕەسول نەبووە, جا جیاوازیش لەنێوان نەبی و ڕەسولیش هەیە زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە بە درێژی باسیان كردوو ئێرە شوێنی ئەوەی نیە لە شەرح وڕاڤەی نامیلكەو پەرتووكەكانی تر دەردەكەوێ (إن شاء الله)بە پشتیوانی خوای گەورە كەوا دەریدەخەین كە جیاوازیان لە نێواندا چیە, جا لەپاشان دەڵێن ئەی نوح تۆ دەبینی ئێمە بە چ گەیشتووین بۆمان وابكە تكایەك بكەی لەلای خوای پەروەردگارت, ئەمە تۆ خوای گەورە ناوی لە تۆ ناوە بەندەی سوپاس كراو جا تكامان بۆ بكە لەلای پەروەردگارت, نابینی ئێمە بە چ گەیشتووین, ئەویش وەكو ئادەم دەفەرمووێ پەروەردگارم ئەمڕۆ تووڕەبوونێكی گرتووە هیچ لەپێشتر ئەو توڕەبوونەی نەبووە نموونەی ئەو توڕەبوونەش نەبووە وە لە دواتریش نموونەی ئەو تووڕەبوونەشی نابێت, وە من یەك دوعا و پاڕانەوەم هەبوو ئەویش كردم بەسەر قەوم و گەلەكەم خوای گەورە جێگیری كرد, ئەوڕۆ هەرخۆم هەرخۆم هەرخۆم بڕۆنە لای جگە لە من بڕۆنە لای ئیبڕاهیم (علیه السلام).

(( فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمِ فَيَقُولُونَ: يَا إِبْرَاهِيمُ أَنْتَ نَبِيُّ اللهِ وَ خَلِيلُهُ مِنْ أَهْلِ الْأرضِ، إِشْفَعْ لَنَا إِلى رَبِّكَ أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ،فَيَقُولُ لَهُمْ إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ ،وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ،وَإِنِّي قَدْ كُنْتُ كَذَبْتُ ثَلَاثَ كَذِبَاتٍ نَفْسَي نَفْسِي نَفْسِي إِذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، إِذْهَبُوا إِلَى مُوسَى))

کاتێك دەچنە لای ئیبراهیم پێی دەڵێن ئەی ئیبراهیم ئێمە هاتینە لای تۆ, تۆ پێغەمبەری خوای تۆ خەلیل و زۆر نزیکی و خۆشەویستی خوای, ئەوە تکامان بۆ بکە لەلای پەروەردگارت نابینی ئێمە کەوتینەتە ناو چ حاڵێکەوە ئەمڕۆ, ئەویش دەڵێ ئەمڕۆ خوای پەروەردگارم تووڕە بوونێکی گرتووە نموونەی ئەو تووڕە بوونەی لە پێشتر نەبووە و لە پاشتریش نابێ, من سێ جار قسەی ناڕاستم کرد, ئەوجا لە پاشان دەفەرمووێ خوای پەروەردگارم ئەوانەی لەسەر گوتم جا لە فەرمووده و ڕیوایەتەکاندا هاتووە قسەکانی ناڕاست مەبەستی پێ چ بووە, دەفەرمووێ هەرخۆم هەرخۆم هەرخۆم بڕۆنە لای جگە لەمن بڕۆنە لای موسا (علیه السلام)

((فَيَأْتُونَ مُوسى فَيَقُولون:يَا مُوسى أَنْتَ رَسُولُ اللهِ،فَضَّلَكَ اللهُ بِرِسالَتِهِ وَبِكَلامِهِ عَلَى النَّاسِ)) کاتێك دەچنە لای موسا پێی دەڵێن ئەی موسا تۆ ڕەوانە کراو و پێغەمبەری خوای, خوای گەورە تۆی پلەدار تر کردوە بە پەیامەکەت و قسەکردنت ڕاستەوخۆ لەگەڵ خوای پەروەردگار لەسەر خەڵکانی تر,((إِشْفَعْ لَنَا إِلى رَبِّكَ))تکامان بۆ بکە لەلای پەروەردگارت,((أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيْهِ)) نابینی ئێمە بە چ گەیشتین وە چمان بەسەر هاتیە,((فَيَقُولُ إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ ،وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ،وَإِنِّي قَدْ قَتَلْتُ نَفْساً لَمْ أُومَرْ بِقَتْلِهَا، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي))دەفەرمووێ ئەمڕۆ خوای پەروەردگارم تووڕەبوونێکی هەیە کە نموونەی ئەو تووڕەبوونەی لە پێشتردا نەبووە وە لە پاشتردا نایێ, وە من کەسێکم کوشت کە فەرمانم پێ نەکرابوو کە بیکوژم, هەرخۆم هەرخۆم هەرخۆم,((إِذْهَبُوا إِلى غَيْرِي))بڕۆنە لای جگە لەمن,((إِذْهَبُوا إِلى عِيسى إِبنَ مَرْيَم))بڕۆنە لای عیسای کوڕی مەریەم(علیه السلام).

((فَيَأْتُون عِيسى فَيَقُلون: ياعِيسى أَنتَ رَسُولُ اللهِ وَكَلِيمَتُهُ أَلْقاها إِلى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنهُ ،وَكَلَّمْتَ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ صَبِيَّاً، إِشْفَعْ لَنَا إِلى رَبِّكَ أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيْهِ؟فَيَقُول عِيسى إِنّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ قَط، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ،وَلَم يَذْكُرْ ذَنْبَاً))

کاتێك دەچنە لای عیسا پێی دەڵێن ئەی عیسا تۆ ڕەوانەکراو و پێغەمبەری خوای, تۆ ئەو وشە و فەرمانەی خوای کە بۆلای مەریەم هات, وە تۆ ئەو ڕوحەی کە خوای پەروەردگار تۆی بەدی هێنا بەبێ باوك, تۆ لەنێو بێشکە و لانکدا قسەت کردووە بە منداڵی بۆ خەڵکی, جا تۆ تکاکاربە بۆلای پەروەردگارت بۆمان, نابینی ئێمە کەوتینەتە چ وەزع و ناخۆشیەکین, جا عیسا دەڵێ بەڕاستی پەروەردگارم ئەمڕۆ تووڕەبوونێکی هەیە نموونەی ئەو تووڕەبوونەی نەبووە لە پێشتر

وە لە پاشتریش نابێ,(( نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي))ئەویش دەڵێ هەرخۆم هەرخۆم هەرخۆم,((إِذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي إِذْهَبُوا إِلَى مُحَمَّدٍ))بڕۆنە لای جگە لە من بڕۆنە لای محمد (ﷺ).

((فَيَأْتُونَ مُحَمَّداً))پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی ئەوانیش دێنە لای من و دێنە لای محمد (ﷺ)پێی دەڵێن,((فَيَقُولُونَ يَا مُحَمَّد أَنْتَ رَسُولُ الله وَخَاتِمُ الْأَنْبِياء وَقَدْ غَفَرَ اللهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَ مَا تَأَخَّرَ إِشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيْهِ))دەفەرمووێ پێم دەڵێن ئەی محمد (ﷺ)تۆ ڕەوانەکراوی خوای و کۆتا و مۆری پێغەمبەرانی (عليهم الصلاة والسلام),وە خوای پەروەردگار لە گوناهەکانی پێشتر و دوایت خۆش بووە جا تۆ تکاکار بە لەلای پەروەردگارت بۆمان, نابینی ئێمە کەوتینە چ حاڵ و وەزعێك؟, جا دەڵێ ((فَأَنْطَلِقُ فَآتِي تَحْتَ الْعَرشِ فَأَقَعُ سَاجِداً لِرَبِّي عَزَّ وَجَلَ))دەفەرمووێ جا منیش دەردەچم لەدوای قسەی وان و دەچمە ژێر بارەگا و عەرشی خوای پەروەردگار دەکەومە کڕنۆش بردن بۆ خوای پەروەردگار,((ثُمَّ يَفْتَحُ اللهُ عَلَيَّ مِنْ مَحَامِدِهِ وَ حُسْنِ الثَّناءِ عَلَيْهِ شَيْئاً لَمْ يَفْتَحْهُ عَلَى أَحَدٍ قَبْلِي)) لە پاشان خوای پەروەردگار دڵم دەکاتەوە و زمانم ڕادەهێنی لەسەر چەند سوپاس گوزاری و ستایشێکی خوای پەروەردگار چەند ستایشێکی زۆر جوانی لەجێ بۆ خوای پەروەردگارم, کە لە پێش من کەسی دی پێی نەبەخشیوە نەیتوانیوە و وابڵێ واسوپاس گوزار بێ,((ثُمَّ يُقَالُ يَا مُحَمَّد))لەپاشان دەگوترێ ئەی محمد (ﷺ),(ارفَعْ رَأْسَكَ))سەرت بەرزکە,((سَلْ تُعْطَهْ))پرسیار بکە پێت دەبەخشرێ,((وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ))تکا بکە تکات ڕابگیرێ,((فَأَرْفَعُ رَأْسِي فَأَقُولُ))جا منیش دەڵێ سەرم بڵند دەکەم و دەڵێم,((أُمَّتِي يَارَبِّ أُمَّتِي يَارَبِّ))ئەی خوای پەروەردگار ئوممەتەکەم ئوممەتەکەم, وە لە پاشانەکە ((فَيُقَالُ يَا مُحَمَّد أَدْخِلْ مِنْ أُمَّتِكَ مَنْ لَا حِسَابَ عَلَيْهِمْ مِنَ الْبَابِ الْأَيْمَنِ مِنْ أَبْوابِ الْجَنَّةِ))پێم دەڵێ خوای پەروەردگار ئەی محمد (ﷺ)لە ئوممەتەکەت ئەوانەی حیسابیان لەسەر نیە لە دەرگای ڕاست لە دەرگاکانی بەهەشت بیانبە ژووری,((وَهُمْ شُرَكَاءُ النَّاسِ فِيمَا سِوَى ذَالِكَ مِنَ الْأَبْوابِ))جا جگە لەو دەرگایەش لە دەرگاکانی تریش ئوممەتەکەت هاوبەشن لەگەڵ خەڵکانی تر و هەر دەچنە ژووری, لە پاشان دەڵێ ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ مَا بَيْنَ الْمِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الْجَنَّةِ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَحِمْيَرَ أَوْ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَ بُصْرَى))پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی جا سوێند بە زاتی ئەو خوایەی کەوا نەفس و گیانی منی بە دەستە لەنێوان دەرگاکانی بەهەشت لەلایەك بۆ لایەکەی تری وەکو

نێوانی (مەككە) و (حومەیرە) یە, یان (مەككە) و (بوسرا) یە كە لە شامە,وە لە هەندێك ڕیوایەت گوتراوە ((مَا بَيْنَ مَكَّةَ وَهَجَرْ))جا ئەوە ئەوەی دەردێخی بەڕێزان فەرموودەكە زۆر شیرین وبەتام بوو وە سوود و كەڵكی لێ وەردەگیرێ, جا پلە و پایەی پێغەمبەرمان (ﷺ)دەردەخات لەبەر هەندێ وا بە درێژی هێنامان كە پێغەمبەر (ﷺ)(شفاعة العظمى) ی بۆ هەیە بچێتە لای خوای پەروەردگار هەموو خەڵكەكە لە مەیدانی حەشر و حیساب ڕزگاریان ببێ, حیساب لەگەڵیان دەست پێ بكات و لەوێ شەفاعەت و تكای تایبەتیشی كرد بۆ ئوممەتەكەی پێغەمبەر (ﷺ)جا لێرەدا دێینە كۆتایی وانەی هەشتەم .

## وانەی نۆیەم

لە دەرس و وانەی نۆیەم لە ڕاڤە ولێكدانەوەی و ڕونكردنەوەی چوار بنەماكەی(شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله)گەیشتینە سەر ئەوەی لەگەڵ دەرس و وانەی هەشتەم لێكی گرێبدەینەوە پێ ڕانەگەیشین لەوێ ئێستا چەند فەرموودە و بەڵگەیەكی تر دەێنینەوە زۆر بە كورتی, ئەوجا پرسیار و وەڵامەكانی قاعیدە و بنەمای دووەم دەینینەوە,ئەوجا دەچینە سەر بنەماو قاعیدەی سێیەم بەپشتیوانی خوای گەورە, لێرە دەڵێین ئەو فەرموودە دوور و درێژەمان هێناوە كە سەلماندمان پێغەمبەر (ﷺ)(شفاعة العظما)ی بۆ هەیە لەمەیدانی حەشر وحیسابدا, وە تكاو شەفاعەتی تایبەتیشی بۆ هەیە, هەر لەو فەرموودەی لە كۆتاییەكەی فەرمووی كە خودای پەروەردگار پێی دەفەرمووێ سەرت بڵند بكە ((إِرْفَعْ رَأْسَكَ سَلْ تَعْطَهْ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ))پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی((فَأَرْفَعُ رَأْسِي فَأَقُولُ أُمَّتِي يَا رَبِّ)) یەكەم جار سەرم بڵند دەكەم و دەڵێم ئوممەتەكەم ئەی خوای پەروەردگارم, كەواتە ئەوە شەفاعەت و تكای تایبەتە بۆ ئۆممەتەكەی, (عظمی) یەكەش ئەوەیە بۆ هەموو هەڵكی و مەردووم لەوێ ڕزگاریان ببێ و حیساب و مەحكەمە شەرعیەكە دەست پێ بكا, ئەوجا خۆشی ئەوەش لە كۆتایی فەرموودەكەی گوتمان پێغەمبەر (ﷺ)خوای گەورە بە ئوممەتەكەی پێغەمبەری (ﷺ)دەبەخشێ پێی دەفەرمووێ برۆ ئەوانەی حیسابیان لەسەر نیە لە دەرگای ڕاست لە بەهەشت بیانبە ژوورێ هەر هەموویان كە پێغەمبەر (ﷺ)ئەوەی وەرگرت دوایی خوای پەروەردگار فەرمووی ئوممەتەكەت لە دەرگاكانی تریش لەگەڵ هەموو خەڵكی تر هاوبەشن و دەچنە ژوورێ, نێوان دەرگاكانیش لە دەرگایەك بۆ دەرگاكەی تر نێوانەكانیان پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی وەكو نێوانی (مەككە) و (حیمەیرە) یە كە دوو شوێنن لەیەك دوورن, یان فەرمووی وەكو نێوانی (مەككە) و (بوسرا) یە كە لە شامە, ئەوەندە فراوانە دەرگاكەی و ئەوەندە گەورەیە واتا خەڵكی زۆر زۆری پێ دادەچی و دەڕوا لە ئوممەتەكەی پێغەمبەریش (ﷺ)ئەوە زۆر دڵخۆشكەر بوو.

وە بەڵگەیەكی تر كە پێغەمبەر (ﷺ)لە قیامەتێ ئەوەی بۆ هەیە لە( موسنەدی ئیمامی ئەحمد) داهاتووە كەوا (طوفەیل) لە (ئوبەی كوڕی كەعب) دەگێڕیتەوە ئەویش لە باوكی ئەویش لە پێغەمبەریەوە(ﷺ)كە پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی ((إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِكُنْتُ إِمَامَ النَّبِيِّنَ وَ

خَطِيبَهُمْ وَصَاحِبَ شَفَاعَتِهِمْ غَيْرَ فَخْرٍ)) دەفەرمووێ ئەگەر ڕۆژی دوایی داهات من پێشەوای پێغەمبەرانم(عليهم الصلاة والسلام)لەوێ وتار بێژ و خەتیبیانم وە من خاوەنی شەفاعەت و تكایانم ئەوە بە فەخر و شانازیەوە نالێم ئەوە ڕاستە و جێگیرە و خوای گەورە پێی بەخشیوم كە پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی .

یان لە بەڵگەی ئەوەش كە ئەویش لە صەحیحی هاتووە كە پێغەمبەر(ﷺ)ئەبو هورەیرە(رضي الله عنه)دەگێڕتەوە كە فەرموودەكە لە صەحیحی بوخاری بە ژمارە (٩٩) تۆمار بووە دەفەرمووێ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه)دەفەرمووێ پرسیارم كرد لە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)گوتم ((مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)) كێیە بەختەوەر لەخەڵكی و مەردووم بە تكای تۆ بۆی لە ڕۆژی دوایی, جا (أسعد) لێرە زانایان دەفەرموون بە مانای سەعیدی دێ نەك سیغە موبالەغەكەی كێ بەختەوەرترینە نا كێ بەختەوەرە, واتا ئەو بەختەوەر دەبێ ئەو كەسەی كە بەر شەفاعەت و تكای پێغەمبەری (ﷺ)كە بۆی دەكاو بۆی جێگیر دەبێ لە ڕۆژی دوایی ، فەرمووی پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی ((لَقَدْ ظَنَنْتُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَنْ لَا يَسْأَلَنِي عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ أَحَدٌ أَوَّلُ مِنْكَ))فەرمووی من گومانم وا بوو كەس پێشی تۆ پرسیارم لێ نەكا دەربارەی ئەو فەرموودە وقسەی ئەی ئەبو هورەیرە, واتا ئەتۆ زۆر پرسیار دەكەی لە پرسیارە شەرعیەكان و فەرموودەكان وە گرینگی دەدەی بە قسەكانی من,((لِمَا رَأَيْتُ مِنْ حِرْصِكَ عَلَى الْحَدِيثِ))لەبەر ئەوەی من تۆ دەبینم زۆر پێداگیری لەسەر فەرموودەكان و قسەكانم ((أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ)) بەختەوەری مرۆڤ بە تكای من لە ڕۆژی دوایی وتمان (أسعد) لێرە بە مانای بەختەوەرترین نایێ بە مانای سەعیدی و بەختەوەر دێ زانایان فەرموویانە,فەرمووی بەختەوەر بە تكاو شەفاعەتی من ئەو كەسەیە ((مَنْ قَالَ لَاإِلَهَ إِلَّااللَّهُ خَالِصاً مِنْ قَلْبِهِ أَوْ نَفْسِهِ))ئەوەی كە (لا إلة إلا الله) بڵێ بە یەكلابوونەوە لە ناخ و دڵیەوە بە پاك و بێگەردی بیڵێ شیرك و ڕیایی لەگەڵ دا نەبێ ئا ئەوە بەختەوەرە بە تكا و شەفاعەتی من.

كەواتە شەفاعەت و تكا لەو فەرموودەی جێگیرە بۆ پێغەمبەری(ﷺ)وە لە پاشانەكە مەرجی ئەوەش كە ئەوەی شەفاعەتی بۆ دەكرێ وەكو لەو فەرموودەیەی هاتیە بروادار بێ و خاوەن ئیخلاص بێ لە ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ)جا شەفاعەت و تكاكانی پێغەمبەری(ﷺ)لە ڕوانگەی

عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە بریتیە لەوەی (شفاعة العظمی), یان جار وایە شەفاعەت لۆ ئەهلی (کبائر) ئەوانەی گوناهی گەورەو مەزنیان کردییە لە ئوممەتەکەی, یان ئەوانەی چووینە ئاگری دۆزەخ بێنە دەرێ لە ئاگری دۆزەخ و بچنە بەهەشت, یان ئەوانەی لە بەهەشتن پلەیان بەرزتر ببێتەوە کەپلەی تەواو بەرزیان بە دەست نەهێناوە, یان ئەوەیە کەوا لە عەزابی جەهەننەم بڕیار دراوە بچنە جەهەننەم ودەپارێزرێن لەسەر تکا و شەفاعەتی پێغەمبەر(ﷺ), کەواتە شەفاعەت و تکاکان جۆراو جۆرن, جا ئەوانەی شەفاعەت وتکاش دەکەن گوتمان پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام)و فریشتەکان وە شەهیدەکان وە پیاوچاکان و بڕواداران ئەوانە شەفاعەت و تکایان بۆ هەیە.

جا لە پاشان دێینە سەر ئەوەی کە لەو بنەمایەی ئایا چ وەردەگیرێتن ئەمە کۆیکەینەوە و پوختی کەینەوە تاوەکو سوودو کەڵکی لی ببینین وەکو عەقیدە و بیرو بڕوا وەکو جێبەجێ کردن لە ژیانی ڕۆژانەماندا, ئەو قاعیدەو بنەمایەی (شیخ محمدی کوری عبدالوهاب ) (رحمه الله)ئەوەی لێ وەردەگیرێت کەوا شەفاعەت و تکا جار وایە ئەگەر بکرێ لە کەسێکی کە ئەو کەسە داوایەکەی لێ دەکرێ جگە لە خوا لە مردووەکان لە گۆر لە بتەکان لە هەر شتێك لەوانە کە لە توانایاندا نیە هیچت بۆ بکەن هیچ زیانێکت لەسەر لابدەن وە هیچ سوودێکت پێ بگەینن ئەو بابەتە تکایە شیرکە لە شیرکی گەورەشە لە ئیسلام دەتباتە دەرێ, چونکە دوعا عیبادەت و پەرستشە پاڕانەوە و تکا کردن عیبادەت و پەرستشە بۆ جگە لە خوای پەروەردگار نابێ لە هیچ کەسێکی تر داوا بکرێت و ڕاستەوخۆ لە خوای داوا دەکرێ, کەواتە ئەوە ئەوەمان بۆ دەردەخات ئەو بنەمایە ئەوەی لێ وەردەگرین کەوا ئەوەی هاوبەشی گەورە و ئاشکرا بکا وە موشریك بێ نە تکای بۆ هەیە وە نە تکاشی بۆ دەکرێ وە قەبوڵ نیە.

وە لەپاشان ئەوەی لێ وەردەگیرێ ئەوەی دەپەرسترێت جگە لە خوای پەروەردگار دەتوانین بڵێین دوو جۆرە جار وایە چاکە پەرستراوەکە جار وایە خراپە, چاکەکە دەپەرسترێت وەکو پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام)ئەوان بۆخۆیان لێی بەرین و خەلکانێك دێن دەیانکەنە هاوبەش و دەیان پەرستن, ئا ئەوە هاوبەشیەکە بەسەر ئەوانی هاوبەشی پەیدا دەکەن و

موشریكن دادەگەڕێتەوە, پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام)پیاوچاكان فریشتەكان ئەوانە هەموویان لێی بەرین ،

وە جاروایە خراپن و شەیتانن وە جنۆكە شەیتانیەكانن وە بت وصەنەمەكانن دەپەرسترێن دار وبەردەكانن یان مرۆڤە تاغوتەكانن یان ڕێباز و بەرنامەیەكی ترە جگە لە ڕێباز وبەرنامەی ئیسلام سەد لە سەد جێبەجێ دەكرێ و كاری پێ دەكرێت و دەپەرسترێ لە جیاتی خوای پەروەردگار یان دەكرێتە شەریك, جا پەرستراوە كە باش بێت یان خراپ بێت پەرستنی غەیری خوای پەروەردگار شیركە وە هاوار بردنە بەری بۆ شتێكی كەوا لە توانای دا نییە بۆت بكا ئەوەشیان شیرك و هاوبەشیە , كەسەكەی لە ئیسلام دەباتە دەرێ دەبێتە خاوەن شیرك و هاوبەشی گەورە پەنا بە خوای گەورە.

وە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ تكا هەیە شەفاعەت هەیە لە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە بەس ئەو تكاو شەفاعەتە سنورداره مەرجی بۆ دانراوە لە لای خوای پەروەردگار, هەروەكو لە ڕابردوو گوتمان دەبێ ئەو كەسەی تكای دەكا لە تواناییدا هەبێ وە ئەو كەسەی كەوا تكای بۆ دەكرێ موسوڵمان بێ, وە لە پاشان خاڵێكی تر خوای تعالی لێی ڕازی ببێ لە هەردووكیان ئەوەی تكاكە دەكا ئەوەی تكاكەشی بۆ دەكرێ ئەوجا ئەو ئیزن و مۆڵەتی خوایشیی وەرگرتبێ, واتا لە دوای ئیزن و مۆڵەتی خوایی تكاكەی بكا, ئەگەر ئەو مەرجانەی لێ هاتە جێ ئەوە ئەو كاتی دروستە و شەرعیە , جا لە پاشان ئەوانە لەو بنەمایەی وەرگیرا دێینە سەر پرسیار و وەڵامەكانی لەسەر ئەو بنەمایەی دامان ناوە .

## پرسیار و وەڵامەكان

یەكەم: هاوبەش پەیداكاران لە پێناو چ هاوار و پەرستش بۆ بت و صەنەمەكان و پەرستراوەكانیان دەبرد و دەیكەن؟

وەڵام: لەپێناو ئەوەی تاوەكو لە خوایان نزیك بكەنەوە پەنا بەخوای گەورە بەنیازی خۆیان, وە تكایان بۆ بكەن وەكو لە ئایەتەكان دەركەوت .

دووەم: ئایا هاوبەش پەیداكاران كار و پەرستشەكانیان كە بۆ بت و پەرستراوەكانیان ئەنجام دەدا پێیان وابوو ئەو پەرستشانە بۆ یان دەیكەن و جێبەجێ دەكەن وە چ بۆچوونێكیان هەبوو؟

وەڵام: پێیان وابوو ئەو پەرستشانەی كە دەیكەن و دەیپەرستن كە ئاژەڵیان بۆ سەر دەبڕن بۆ بت و صەنەمەكانیان كە بەدەوریاندا دەسوڕانەوە و لەبەریان دەپاڕانەوە, كە سەربڕینی ئاژەڵ و بە دەوردا سوڕانەوە و تەواف ئەوانە تایبەتن بە پەرستش تەنها بۆ خوای پەروەردگار بڕیارەو نابێ بۆ هیچ كەس و شتێكی تر بكرێ ئەوان پیان وا نەبوو ئەوانە پەرستراوی سەربەخۆن و دەیان پەرستن دەیان گوت ئەوانە دەكەینە نێوەند لە نێوان خۆمان و خوای پەروەردگار تا نزیكمان بكەنەوە وەكو دەیان گوت﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلاَّ لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾(الزمر آية: ٣). وە دەیان گوت ﴿وَيَقُولُونَ هَؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّهِ﴾(يونس اية: ١٨)واتە:دەیان گۆت ئەوانە دەبنە تكاكاری ئێمە لە لای خوا, كەواتە لەو پیناوەی بوو دەیان پەرستن هەروەكو لەسەردەمی خۆشمان پەنا بە خوای دەڵێن غەوسەكەی ماڵ لە بەغدایێ پەنا بە خوای مەبەستی پێ لە (شێخ عبدالقادری گەیلانی) یە یەعنی لە هانام وەرە, یان كاتێك دەكەونە ناو ناخۆشیەك و زەحمەتییەكی هاواری غەیری خوای پەروەردگار دەكەن, یەعنی دەڵێن یا (شێخ عبدالقادری گەیلانی) هاوارە فلانە هاوارە ئاگات لێمان بێ پیری فلان, شاهۆ نازانم چ مەرقەدی فلانی ئەوەم لەسەر بێ بۆت بكەم ڕزگارمان ببێ, ئەوانە هەمووی شیركی گەورەیە , با كەسەكە نوێژی بكە ڕۆژی بگرێ زەكاتی بدە بچێتە حەج و عومرەی هەموو قورئانیشی لەبەر بێ ئا ئەوە بڵێ و بكا لە شیركە ئاشكراو گەورەكانە فڕی بە سەر ئیسلامەوە نامێنێ و لە ئیسلام دەردەچێ پەنا بە خوا.

سێیەم: نموونەیەك بهێنەوە لەسەر بت و پەرستراوەکانی هاوبەش پەیداکارانی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)؟

وەڵام: (لات و عوززا و مەنات) ئەوانە سێ بتی ئاشکرا و دیاری پەرستراو بوون لە لایان هاوبەش پەیداکاران, کە جگە لە خوای ئەوانیان دەپەرست و هانایان بۆ دەبردن و وە دەیان گوت لە خوامان نزیك دە کەنەوە پەنا بە خوا.

چوارەم: بە گشتی تکا و شەفاعەت دەبێتە چەند جۆر؟

وەڵام: دەبێتە دوو جۆری سەرەکی تکای رەتکراوە (الشفاعة المنفية)و تکای جێگیر(الشفاعة المثبتة).

پێنجەم: پێناسەی تکای ڕەتکراوە(الشفاعة المنفية) بکە بەنموونە و بەڵگەوە؟

وەڵام: تکای ڕەتکراوە (الشفاعة منفية) بریتیە لەو شەفاعەت و تکایەی کە داوا دەکرێت لە جگە لە خوای پەروەردگار بۆ کارو ئیشێك کە ئەو کارو ئیشە تەنها لە توانای خوای پەروەردگارە و لە دەسەڵاتی ئەو دایە, وەکو ئەوەی تکا بکەی کە کەسیك بتباتە بەهەشت یان نەهێڵێ تۆ بمری یان ژیانت پێ ببەخشێ یان ڕزگارت بکا لە تەنگەشەیەکی نەهێڵێت زیانت پێ بگات یان سوودت پێبگەیەنێ پەنا بە الله , ئا ئەوانە نموونەکەیتیان وەك خوای گەورە فەرموویەتی ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ يَوْمٌ لَا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَاعَةٌ وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾(البقرة آية: ٢٥٤).

شەشەم: پێناسەی تکای جێگیر(الشفاعة المثبتة) بکەبە نموونە و بەڵگەوە؟

وەڵام: تکای جێگیرئەو تکایەیە کە لە خوای پەروەردگار داوا دەکرێت وە لە پاشان بۆ کەسێکی دەکرێ کە موسوڵمانە وە لە دوای مۆڵەت وەرگرتن لە خوای پەروەردگار کە خوای گەورە لەو کەسەی ڕازییە کە تکای بۆ دەکرێت و وە لەو کەسەش ڕازییە کە تکاکە دەکاتن وە مۆڵەتیش دەدات, کەواتە بەو مەرجانە دروستە وەکو خوای گەورە دەفەرمووێ﴿مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ

﴿إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾(البقرة آية: ٢٥٥).کێ هەیە بتوانێ تکای لەلای خوای پەروەردگار بکات مەگەر بە مۆلەتی خوایی ئەوکات دەتوانێ بیکات.

حەوتەم: جیاوازی لە نێوان تکای ڕەتکراوە و تکای جێگیر چیە ؟

وەڵام: جیاوازی لە نێوانیان دەتوانین بڵێین ئەو خاڵانەن:-

1.تکای جێگیر دەبێت بە ڕەزامەندی خوا بێت و دەبێت خوا لە تکا بۆ کراوەکە ڕازی بووبێت .

2.تکای جێگیر دەبێت خوا مۆڵەتی دابێت کە تکاکە بکرێت .

3.تکای جێگیر لە خوای داوا دەکرێت و نابێت لە کەس و شتیکی تر داوا بکرێت, بۆ نموونە دەڵێی خوایە پێغەمبەرەکەت(ﷺ)بکە تکاکارم, ناتوانی بڵێی ئەی پێغەمبەر(ﷺ)تکاکارم بە, چونکە لە دەسەڵاتی خۆی دا نییە پێغەمبەر (ﷺ)تکاکارت بێت, جا ئەوە ئەوەی ناگەینێت بێ ڕێزیە لەگەڵ بێغەمبەر(ﷺ)بەڵکو ئەوە خوایەتی خوای جێگیر دەکەی و وە خوای تعالی ڕێگەت پێدەدا داوای لێ دەکەی کەپێغەمبەرت(ﷺ)بۆ بکاتە تکاکار .

4.تکای جێگیر خاوەنەکەی تکابۆ کراو سوودی لێ دەبینێت و قازانجی لێ دەکات یان پلەی بەرز دەبیتەوە یاخود تۆڵەی لەسەر لا دەکەوێ یان کەم دەبێتەوە یان لە گوناهی دەبووردرێت.

5.بەڵام تکای رەتکراوە جگە لە خوای داوا دەکرێ یان بۆ کەسێك داوا دەکرێ کە خودا لێ ڕازی نیە یان خوا مۆڵەتی پێنەدایە وە سوودیشی بۆ تکابۆ کراو نابێتن بەڵکو جار وەیە زەرەرو زیانی بۆی دەبیت ئەگەر بڕوای پێ هەبێ.

## وانەی دەیەم

وَالْقاعِدَة الثَّالثَة: أَنَّ النَّبيّ صَلَّى اللهُ عَلَيْه وسَلَّم ظَهَرَ على أُناسٍ مُتَفَرِّقِين في عِبادَاتِهم مِنْهُم مَن يَعْبُدُ الْمَلائكَة. ومِنْهُم مَنْ يَعْبُدُ الْأَنْبِياءَ والصَّالِحِين. ومِنْهُم من يَعْبُدُ الْأَشْجارَ وَالْأَحْجار. ومِنْهُم من يَعْبُدُ الشَّمْسَ وَالْقمَر. وقاتَلَهُم رَسُولُ الله صَلّى الله عَلَيْه وَسلَّم ولَمْ يُفرِّق بَيْنَهُم.

وَالدَّلِيلُ قَوْلُه تعالى: {وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّه}(الأنفال آية: ٣٩).

وَالدَّلِيلُ الشّمْسِ وَالْقمَر قَوْلُه تَعالى: {وَمِنْ آيَاتِه اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّه الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ}(فصلت آية: ٣٧).

وَالدَّلِيلُ الْمَلائكَة قَوْلُه تعالى: {وَلا يَأْمُرَكُمْ أَنْ تَتَّخِذُوا الْمَلائِكَةَ وَالنَّبِيِّينَ أَرْبَاباً}(آل عمران آية: ٨٠).وَالدّلِيلُ الْأَنْبِياء قَوْلُه تعالى: {وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنْتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَهَيْنِ مِنْ دُونِ اللَّه قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِنْ كُنْتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ}(المائدة آية: ١١٦).

وَالدّلِيلُ الصّالحِين قَوْلُه تعالى: {أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ}(الإسراء آية: ٥٧).

وَالدَّلِيلُ الْأَشْجارِ وَالْأَحْجارقَوْلُه تعالى: {أَفَرَأَيْتُمُ اللاَّتَ وَالْعُزَّى وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَى}(النجم آية: ١٩-٢٠).

وَحَديثُ أَبِي واقد اللَّيْثي رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قال: "خَرَجْنا مَعَ النّبيِّ صَلّى اللهُ عَلَيْه وَسَلّم إلى حُنَيْن ونَحْنُ حُدَثاءُ عَهْد بِكُفْر، وَلِلْمُشْرِكِين سِدْرَةٌ يَعْكُفُونَ عِنْدَها وَيَنُوطُونَ بها أَسْلِحَتَهُم يُقالُ لَها ذاتُ أَنْواط. فَمَرَرْنا بِسِدْرَةٍ فَقُلْنا: يا رَسُولَ الله اجْعَلْ لَنا ذاتَ أَنْواط، كَما لَهُم ذاتُ أَنْواط". الْحَدِيث.

گەیشتینە سەر قاعیدە و بنەمای سێیەم (القاعدة الثالثة) بنەمای سێیەم (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب)(رحمه الله) دەفەرمووێ ﴿أن النبي صلى الله عليه وسلم ظهر على أناس متفرقين في عباداتهم﴾بەڕاستی پێغەمبەر(ﷺ)بە دیار كەوت لەناو خەڵكانێك كە جیاواز بوون لە پەرستشیان و لەوانەی كە دەیان پەرست

﴿منهم من يعبد الملائكة﴾هەیان بوو فریشتەیان دەپەرست,﴿ومنهم من يعبد الأنبياو والصالحين﴾وەهەیان بوو پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکانیان دەپەرست,﴿ومنهم من يعبد الأشجار والأحجار﴾وە هەیان بوو داریان دەپەرست و بەردیان دەپەرست,﴿ومنهم من يعبد الشمس والقمر﴾وە هەیان بوو خۆر و مانگیان دەپەرست,
﴿وقاتلهم رسول الله صلى الله عليه وسلم ولم يفرق بينهم﴾وە پێغەمبەر(ﷺ)کوشتار و جەنگی لەگەڵ هەموویان کرد جیاوازی نەخستە نێوانیان, بڵێ ئەوانەی پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام)دەپەرستن با کوشتار و شەڕیان لەگەڵ نەکەم بە کافر و موشریکیان دانەنێم چونکە پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام)دەپەرستن, یان ئەوانەی پیاوچاکانیان دەپەرست لەگەڵ ئەوانەی دار و بەردیان دەپەرست یان خۆر و مانگیان دەپەرست هەموو لەیەك بازنەی کۆبونەوە, بازنەی ئەوەی کە موشریکن و هاوبەش پەیداکارن کە کافر و بێ بڕوانە بەبێ جیاوازی پێغەمبەر(ﷺ) کوشتار و جەنگی لەگەڵ هەمووان کرد ﴿والدليل قوله تعالى﴾بەڵگەش فەرموودەی خوای بەرزە ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾(الأنفال آية: ٣٩).
واتە: خوای پەروەردگار فەرمووی شەڕ و کوشتاریان لەگەڵ بکە هەتا ئەوانە نەبنە فیتنە و شەڕ و ئاشوب, واز بێنن لە شیرك و هاوبەشی و کوفر وە ئاین و ڕێباز هەموو ببێتە هی خوای پەروەردگار و کار و ئیشی پێ بکرێ.
﴿والدليل الشمس والقمر﴾ وە بەڵگەی خۆرو مانگ کە دەپەرستران ئەوەیە ﴿قوله تعالى﴾فەرموودەی خوای بەرزە﴿وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾(فصلت آية: ٣٧). واتە:لە ئایەت و نیشانەکان و بەڵگەکانی بوونی خوای پەروەردگار دەسەڵاتی شەو و ڕۆژە وە مانگ و خۆرە ئێوە کڕنۆش مەبەن بۆ خۆر و مانگ بەڵکو کڕنۆش بەرن بۆ خوای پەروەردگار کە ئەوانەی بەدیهێناوە ئەگەر ئێوە دەتانەوێت بە تاك و تەنهایی خوای بپەرستن و ببنە بڕوادار.
﴿والدليل الملائكة﴾وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی فریشتەکان دەپەرستران ﴿قوله تعالى﴾فەرموودەی خوای بەرزە﴿وَلا يَأْمُرَكُمْ أَنْ تَتَّخِذُوا الْمَلائِكَةَ وَالنَّبِيِّينَ أَرْبَاباً﴾
(آل عمران آية: ٨٠)

واتە:ئێوە فەرمانتان پێنەكراوە فریشتەو مەلائیكەتەكان و پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)بە پەروەردگار و خواو پەرستراو دابنێن و بیان پەرستن.

﴿والدليل الأنبياء﴾وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام)دەپەرستران پەنا بە خوا ﴿قوله تعالى﴾فەرموودەی خوای بەرزە ﴿وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنْتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَهَيْنِ مِنْ دُونِ اللَّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِنْ كُنْتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ﴾(المائدة آية: ١١٦) .

واتە:خوای گەورە دەفەرمووێ ئەو كاتەی خوای پەروەردگار فەرمووی ئەی عیسای كوڕی مەریەم تۆ بە خەڵكیت گوتووە من و دایكم بە دوو پەرستراو بگرن و بێجگە لە خوای بمان پەرستن عیساش دەفەرمووێ پاك و بێگەردی بۆ تۆ خوای پەروەردگار لە قسەو شتێكی كە حەق و ڕەوا نیە بیكەم وە وا نیە ئەگەر واشم گوتبا تۆ عیلم و زانستیت پێ هەبوو ئەی خوای پەروەردگار تۆ ئەوەی لە ناخ و دڵی منە دەیزانی من ئەوانە نازانم كە لە نەفسی تۆیە ﴿إِنَّكَ أَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ﴾ واتە:تۆ بەڕاستی زۆر زانای بە شتە نادیارەكان.

﴿والدليل الصالحين﴾وە بەڵگەی ئەوەی پیاوچاكان دەپەرستران ﴿قوله تعالى﴾فەرموودەی خوای بەرزە ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ﴾(الإسراء آية: ٥٧).

واتە:ئا ئەوانەی كەوا دوعا و پاڕانەوەیان دەكرد و بۆلای خۆیان وەسیلە و نێوەندیان دادەنا لە پیاوچاكان كە هاواریان دەكرد كە لەنێو ئێمەش هەیە یا شێخ فلان یا فلانەكەس كە بەحیساب پیاوی چاكە دەبتە نێوەنگیر لە نێوان ئەو و خوای كە تكای بۆ بكە پەنا بە خوای گەورەیان نزیكی بخاتەوە.

﴿والدليل الأشجار والأحجار﴾وە بەڵگەش لەسەر دار و بەرد كە دەپەرستران ﴿قوله تعالى﴾فەرموودەی خوای بەرزە﴿أَفَرَأَيْتُمُ اللاَّتَ وَالْعُزَّى * وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الأُخْرَى﴾ (النجم آية: ١٩–٢٠)

واتە:ئایا ئێوە لات و عوززاتان بینیوە یان مەناتتان بینیوە ئەو سێیە دەیپەرستن بێجگە لە خوای پەروەردگار و هاناو هاواری بۆ دەبەن بۆتان وایە کەلە خواتان نزیك دەخاتەوە ئەوانە ئەوەشیان لە دەسەلآت و دەست دانیە, جا لەبەر ئەوەی (لات) پێناسەمان کرد وتمان یان بەردێك بووە کە دەپەرسترا چونکە لەسەر ئەو بەردەی پیاوێك هەبووە کەوا دەهات گەنمی دەهاڕی یان ئاردی پەیدادەکرد یان کەپەکی پەیدادەکرد یان پیرخەنی وەکو لە کوردەواری خۆماندا دەڵێن لەگەڵ ئاو تێکەڵی یەکی دەکرد و لەسەر ئەو بەردەی دایدەنا و دەیبەخشی بەوانەی کەوا دەهاتن بۆ حەجی ماڵی خوا, لەو سەردەمی کە کەسەکە کەسێکی باش بووە (إبن عباس)(رضي الله عنهما)دەڵێ لە دوای ئەوەی کە مردیە ئەوانی کە لەسەردەمی ئەوی بووینە لەبەر باشی وی بەیادهێنانەوەی ئەوی هاتینە بەدەوروبەری بەردەکەی دەسوڕانەوە و هاواریان لێ دەکرد و یان خوێنیان بۆ دەڕێشت و ڕێزیان لێدەگرت و دەیان پەرست پەنا بەخوای رب العالمین, وە عوززاش ئەو دارە بوو کە وتمان شەیتانێکی مێینەی تێدا بووە کەوا سەرنجی ڕادەکێشان ئەوە بوو (خالیدی کوڕی وەلید) (رضي الله عنه)لەگەڵ سی کەسی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانی نارد و عوززایان لەبن هێناو کوشتیان عوززایان نەما جارێکی تر بیپەرستن, وە مەناتیش بەهەمان شێوە کەواتە ئەوانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەیدار و بەرد دەپەرستران.

وە لەپاشان حەدیسێکی هێنایەتەوە (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب)(رحمه الله) لە کۆتایی بنەمای سێیەم کە ئەویش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دارەکان دەپەرستران و یان پیت و بەرەکەتیان لێ داوا دەکرا و وەردەگیرا ئەویش دەفەرمووێ ﴿وحديث أبي واقد الليثي رضي الله عنه قال﴾وە فەرموودەی باوکی واقیدی لەیثی(رضي الله عنه)لە (بەنو لەیث)بووە کە ئەوانە بوون کە مەناتیان دەپەرست, وە لە پاشانەکە ئەو پیاوە ئایا لە جەنگی بەدر موسوڵمان بووە یان لە فەتحی مەککەیەوە موسوڵمان بووە جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان وە قسەی زۆری لەسەر دەکەن, وە ئەو پیاوە بەڕێزە صەحابی پێغەمبەری(ﷺ)بووە فەرمووی ﴿خَرَجْنَا مَعَ النَّبِي صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم إِلَى حُنَيْن﴾ ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری(ﷺ)دەرچووین بەرەو (حونەین), کە شوێنێك بوو لە نێوان (تائیف) و (مەککە)ی ﴿وَنَحْنُ حُدَثَاءُ عَهْدٍ بِكُفْرٍ﴾وە ئێمە تازە لە کافرایەتی بووینە موسوڵمان واتا نزیك بووین لە کوفر لەمێژ نەبووبوو بووینە موسوڵمان,﴿وَلِلْمُشْرِكِينَ سِدْرَةٌ يَعْكُفُونَ عِنْدَهَا﴾وە موشریك و کافرەکان دارێك هەبوو کە (نەبەقی) پێ دەگوترێ (سیدرە) لە

کوردی واتا درەختی تاوب یان تاوگ یان تایلە یان نەبەگ پێی دەگوترێ ئەوە دەچوون ئەو دارەیان هەبوو,

﴿وَيَنُوطُونَ بِهَا أَسْلِحَتَهُمْ﴾وە موشريك و هاوبەش پەيداكاران چەكەكانی خۆيان پێوە دەكرد, پێيان وابوو ئەگەر چەكی پێوە بكەن دوايی چەكەكەی لە شان بكەن و بچن شەڕو كوشتاری پێبكەن سەردەكەون و پيت و بەرەكەتی ئەوەيان بۆ دێ سەردەخرێن بەهۆی ئەوەی چەكەكانيان بەدارەكانيان وەكرديە, ﴿يُقَالُ لَهَا ذَاتُ أَنُواط﴾بەو دارەيان دەگوت خاوەنی (ئەنواگ)واتا شوێنی هەڵواسينی چەكەكانيان,﴿فَمَرَرْنَا بِسدْرَةَ﴾ئيمەش بەلای دارێك داچووين بەلای درەختی (تاوب) تايلەيەكی داچووين,﴿فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ﴾گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا: (ﷺ)﴿اجْعَلْ لَنَا ذَاتَ أَنواط، كَمَا لَهُمْ ذَاتُ أَنُواط﴾تۆ بۆ ئێمەش ئەوها ئەنواتێكمان بۆ دانێ دارێك بێت چەكەكانمان پێوە بكەين وەكو كافر و موشريكەكان كەوايان وتووە و وايان كردووە, پێغەمبەر(ﷺ)لە وەڵاميـاندا قسەيەكی پێ گوتن ئەويش قسەكە زۆر لە جێ بوو كە ئيختيلاف و جياوازيش لەسەر ئەوەش دروست بووە هەندێ دەڵێن ئەوە (عذر به جهل) ـــ وە بيانووی نەفامی بۆ ئەو كەسانەی كەوا نازانن ئەگەر شيركی گەورەش داوابكەن و يان ئەنجامی بدەن هەيە پێی موشريك وكافر نابن, جا ئەوە وانيە ڕای پەسەندی ئەهلی سوننە و جەماعەی لەسەر وەيە ئەو فەرموودە ئی ئەوەی بوو كە پێغەمبەر (ﷺ)لە وەڵاميـاندا فەرمووی ئێوە قسەيەكی دەكەن هەروەكو قەومی موسای بە موسايان گوت , گوتيان ئەوانە پەرستراويان هەيە تۆش پەرستراويكی دابتاشە بۆ ئێمە بۆ ئەوەی ئێمەش بيپەرستين پەنا بە خوای گەورە ئێوە قسەيەكی گەورەتان كرد,

جا ئەوە ئەوەی لێ وەرناگيرێ بەڵكو ئەوە ئەوەی لێ وەردەگيرێ كە ئەوانە بۆ خۆی باوكی واقيدی لەيثی دەڵێ ئێمە تازە ببووينە موسوڵمان و نزيك بووين لە كوفر جا بەيەك دەنگی زانايانی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەگەر كەسێك تازە بووبێتە موسوڵمان نەشارەزابێت ئەگەر شيركی گەورەشی كرد و كوفری گەورەشی كرد ئەو كاتە بەبێ حوججە خوێنی حەڵاڵ نابێت وە ئەگەر ناوی لێ نەنرێت موحيد و موسوڵمان و بڕواداريش, بەڵام بڕياری لەسەر نادرێ لە دوای حوججەكەيەوە ئەگەر ماوە لەسەر شيرك و هاوبەشی يان لە سەر كوفرە ئاشكراو گەورەكەی ئەوە ئەوكاتی خوێنی حەڵاڵيش دەبێ وە ئەو كاتە كوشتاری لەگەڵ دەكرێ وە بە كافرو

موشریكیش ناو دەبردرێ حیسابی حیسابی ئەوان دەبێت جا هەندێك دەڵێن ئەوە لە فەتحی مەككەی موسوڵمان بووە (حونەین) یش هەر ڕستەوخۆ بەرەو وێندەر چووینە, وە هەندێك دەڵێن مەسەلەی ئەوەیە عوزریان ئەوە بوو كەتازە ببوونە موسوڵمان هەموو صەحابیەكان ئەو داوایەیان نەكرد ئەوانە داوایان كرد كە نەیاندەزانی و شارەزانەبووبوون وەكو پرسیارێك بوو پێغەمبەر(ﷺ)حوججەی بەسەر كردن و ڕۆنی كردەوە یەكسەر ئەوان بڕوای وایان لە دڵ و مێشكی نەما وە بە كار و كردەوە ئەنجامیان نەدا, كەواتە ئەوە نابێتە بەڵگە بۆ ئەوەی بڵێن (عذر بە جهل) واتا بیانووی نەفامی هەیە بۆ ئەو كەسانەی كەوا شیركی گەورە و كوفری گەورە و ئاشكرا بكەن, یان ئەوانەی زەروراتی دینە ئەگەر بڕواشیان پێ نەبێ یان كاری پێ نەكەن بە كافر و موشریك حیساب نابن هەتاكو حوججەیان لەسەر نەكرێ .

## وانەی یازدەیەم

تەواوکەری وانەی دەیەم لەسەر قاعیدە و بنەمای سێیەم وەستابووین شەرح وڕاڤەیەکی کورت و پوختمان کرد, ئێستاچەند هەڵوەستەکی لەسەر دەکەین, یەکەم هەڵوەستە لەسەری ئەوەیە کەوا لەسەردەمی ئێمەشدا زۆر ئەوانەی کە دەپەرسترێن جار وەیە پیاوچاکن پەنا بەخوای گەورە جار وەیە پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام)جا ئەوە ئەوە ناگەینی ئەگەر پیاوچاکت پەرست ئەگەر پێغەمبەرانت(علیهم الصلاة والسلام)پەرست لێت قبوڵە و بە شیرك و هاوبەشی حیساب نیە لەبەر ئەوەی خوای گەورە هەمووی ڕەتکردیتەوە شیرك و هاوبەشی ئەوەش ناگەینی کەبیانووی ئەوەی دەگرن دەڵێن باشە بۆ (شێخ عبدالقادری گەیلانی) کە ئێمە دوعای لە بۆی بکەین و بپاڕێینەوە لەبەری بیکەینە نێوەند و نێوان لە نێوان خۆمان وخوای پەروەردگار (شێخ عبدالقادری گەیلانی) پیاوێکی خراپ بووە, نەخێر بە دڵنیایەوە ئێمە بڕیاری ئەوەی نادەین پیاوێکی خراپ بووە بەڵکو بەباشە ناوی تۆماربووە و هاتیە,زانایان یەك دەنگیان هەیە لەپاش وەفاتیشی بە باشە ناویان بردووە کەسێکی ئەهلی سوننە و جەماعەی بووە (رحمه الله), بەڵام ئەوە ئەوەی ناگەینی کە ئەو خراپ بووە ئەوەی دەگەینی عەمەل وکردار و قسە و گوتن و پەرستش و شیرك و عیبادەتەکەی وان کە دەیکەن بۆ ئەوەی کە بە شیرك حیسابە ئەوەیان خراپە وتاوانە لە تەرازووی قورئان و سوننە, کەواتە (شێخ عبدالقادر) ئاگاشی لێ نیە وە ئەوە حیسابیشی پێ لەسەر ناکرێ, ئەدی ئەوە نەبوو خوای پەروەردگار دەربارەی عیسای(علی نبیّنا وعليه الصلاة والسلام) فەرمووی لە ئایەتەکەی و ڕوونمان کردەوە کە خوای گەورە فەرمووی ﴿أَأَنْتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَهَيْنِ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ واتە:ئایە تۆ بە خەڵکیت گوتووە ئەی عیسا من و دایکم بێجگە لە خوای بکەنە دوو پەرستراو و بمان پەرستن,﴿قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ﴾(المائدة آية: ١١٦).

واتە:بە دڵنیاییەوە دەفەرمووێ ئەمە حەق و ڕەوانیە من ئەو قسەیەی ناکەم و پاکی و بێگەردی بۆ تۆ خوای پەروەردگار, من بۆم نەهاتووە وابڵێم و وام نەگوتووە هاتا کۆتایی ئایەتەکەی, کەواتە پیاوچاکانیش بە دڵنیاییەوە لە مەیدانی حەشر و حیساب ئەگەر پرسیاریان لێ بکەن بەریئن وە لەگەڵ ئەوەی دانینە بکرێنە شەریك و هاوبەش بۆ خوای پەروەردگار پەنا بە خوای.

جا لە پاشان ئەوانەی دەپەرسترێن جۆراوجۆرن وەکو لەسەردەمی ئێمەش جاروایە دار دەپەرسترێ جاروایە بەرد دەپەرسترێ جاروایە مرۆڤ دەپەرسترێ جاروایە مرۆڤەکە باشە یان خراپ جاروایە جنۆکە دەپەرسترێ جاروایە فریشتە دەپەرسترێ, مرۆڤەکان لە باشەکان پێغەمبەرانن(علیهم الصلاة والسلام) پیاوچاکانن ئەوانە هەر هەمووی بە شیرك حیسابە, لە سەردەمی ئێمەش ئەوەش هەیە کە جاروایە بەرنامە و ڕێباز دەپەرسترێ بێجگە لە بەرنامە و ڕێبازی خوای پەروەردگار بەرنامە و ڕێبازێکی تر لە عەلمانیەت ودیموکراتیەت و سۆشیال دیموکراتیەت و... هتد. ئەوانە دەپەرسترێن و دوای دەکەون و فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن, کەسەکە دەشرێ شیرك و هاوبەشیم نەکردووە وە کوفریشم نەکردووە من موسوڵمانیشم, جا ئەوانە هەر هەمووی هەر کەس و شتێك بپەرسترێ بێجگە لە خوای پەروەردگار کە پەرستراوەکان جۆراو جۆر بووە لە کۆنەوە وەکو (شێخ محمد کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله) فەرمووی تاوەکو ئێستاش وە هی نوێتریش ڕەنگە بێتە کایەوە لە هەر سەردەم و کاتێکی,

گرینگ بنەماکە ئەوەیە هەرکەس و شتێك بێجگە لە خوای پەروەردگار هانا و هاواری بۆبردرێتەبەر وە لە شتێکی کە تەنها لە توانای خوا پەروەردگار دا هەیە یان بپەرسترێ یان حەڵاڵت بۆ حەرام بکە یان حەرامت بۆ حەڵاڵ بکە ئەوانە ئیجماعیان لەسەرە تۆ بەقسەی بکەی یان بەدوای بکەوی یان کڕنۆشی بۆ بەری یان بەدەوریدا بسوڕێیەوە و تەواف بکەی ئەوکەسە مردوو بێ یان زیندوو بێ ئەوجە لە پاشانەکە حەیوان وئاژەڵی بۆ سەرببڕی ئەوە ئەوکاتە شیرکت کردووە پەنا بە خوای گەورەوە موسوڵمانەتی و بڕواداریێتیت نامێنێت و ئەوکاتی خوای پەروەردگار لێت وەرناگرێ, وەکو خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَارِدُونَ * لَوْ كَانَ هَؤُلَاءِ آلِهَةً مَا وَرَدُوهَا﴾(الأنبياء آية: ٩٨-٩٩)

واتە:دەفەرمووێ ئێوە وە لەگەڵ ئەوانەی دەیپەرستن بێجگە لە خوای پەروەردگار ئێوە دەبنە ئاگر خۆشکەر وە سوتەمەنی ئاگری دۆزەخ وە دەچنە ناو ئاگری دۆزەخ, جا خۆ ئەگەر ئەو پەرستراوانەی ئێوە دەیپەرستن ئەوە مەبەست پێ ئەوەیە جگە لە پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان شتەکانی تر و کەسەکانی تر کە دەپەرسترێن کە تاغوتن و ڕازینە بەو پەرستنەی بۆیان ئەنجام دەدرێ خوای پەروەردگار دەفەرمووێ جا ئەگەر ئەوان پەرستراون و خوانە و دەسەلاتیان هەیە بۆچی دەچنە ناو جەهەننەم و دەبردرێنە ناو جەهەننەم و هیچیان لە

دەست نایەت, جا لەبەر ئەوەی بوو دەڵێن عەرەبەکان ئەو کاتی گوتیان ئێمە کەواتە لەگەڵ عیسای دەبین لەگەڵ عوزەیری دەبین فلان ناوی پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام) دەبین, خوای گەورە ئەو ئایەتەشی دابەزاند فەرمووی ﴿إِنَّ الَّذِين سَبَقَتْ لَهُمْ مِنَّا الْحُسْنَى أُولَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ * لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا﴾(الأنبياء آية: ١٠١–١٠٢)

وە لە پاشانەکە دەشبینین جار وەیە بیانووی بەوەش دەگرن ئەوانەی هاوبەش و شیرکی پەیدادەکەن دەڵێن خوای پەروەردگار لەو قورئانەی کە فەرموویەتی ﴿وَمَنْ يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِنْدَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ﴾(المؤمنون آية: ١١٧) .

واتە:ئەوەی کەوا بێجگە لە خوای پەروەردگار بە خوا و پەرستراو بزانێ هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەبێ بێگومان ئەوانە حیسابیان بۆ لای خوایە وە خوای پەروەردگار کافر و بێبڕوایان سەرفراز ناکاتن, دەڵێن ئەدی ئەگەر ئێمە بەڵگەمان بۆ هێناوە کە ئەوەی دەیپەرستین وئەنجامی دەدەین لەگەڵ خوای پەروەردگار دەڵێن مەفهوومی موخالەفەی ئەو ئایەتەی ئەوەی لێ دەوەشێتەوە, پەنا بەخوا ئەوە ئەوەی لێ ناوەشێتەوە بەڵکو ئەو ئایەتە مەفهووم موخالەفەی نیە, چونکە ئەوەی بە بەڵگە و بێ بەڵگە بەڵگەی بۆ دەیننەوە بەڵگەیان نیە کە دەپەرستێ بێجگە لە خوای پەروەردگاریان لەگەڵ خوای پەروەردگار ئەوە هەر شیرك و هاوبەشیە, وەکو ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا﴾ (النور آية: ٣٣)

واتە:ئێوە ئەوانەی کە دەیانەوێ داوێن پارێزبن ئەوانەی لە جاریەکان و لەوانەی لە ژێردەستانن ئێوە ناچارین مەکەن بەوەی کەوا بەدڕەوشتی بکەن پەنا بەخوای گەورە ئەوانەی دەیانەوێ داوێنپارێزبن, ئەگەر بڵێین مەفهوومی موخالەفەی بۆ ئەو ئایەتەی هەیە پەنا بەخوای گەورە یەعنی ئەوەی نایەوێ داوێن پارێزبێت حەزی بە زینا و فاحیشەیە دەبێ لێ بگەڕێین کەوا دەبێ بە گوێرەی ئەو ئایەتەی بی و بەو تێگەیشتنی ئەهلی شیرك و کوفر و گومڕایی دەڵێن کەوا زیناکەی بکەن مادام بەخۆیان حەزیان لەوەی نیە کە داوێنیان پارێزراوبێ, نەخێر ڕێگریان لێ دەکەرێ ئەگەر حەزیشیان پێنەبی حەزیشیان لە زینای بی هەر ڕێگەیان پێنادرێ چونکە ئەو ئایەتە و ئەو ئایتەش کە لەپێشتریش گوتمان ﴿وَمَنْ يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِنْدَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ﴾ (المؤمنون آية: ١١٧)

کە مەفهووم موخالەفەیان نیە و ئەوەیان لێی وەرناگیرێت ئەوەی بەڵگەی هەبێ بۆ ئەوەی شیرك و هاوبەشی بکات و یان بەڵگەی بۆ بێنێتەوە پەنا بە خوا گەورە.

جا لە پاشان ئەوە ئەوەمان بۆ دەردەخات ئەوانەی ئەو شیرك و هاوبەشیەیان کردیە و ئەنجامیاندایە هیچ یەکێکیان پێغەمبەر (ﷺ)جیاوازی نەخستە نێوانیان یان خوای پەروەردگار، پرسیارەکە ئەوەیە پرسیار لە خۆت بکە ئایا خوای پەروەردکار جیاوازی خستە نێوان ئەوانەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)دەپەرستن یان ئەوانەی پیاوچاکان دەپەرستن یان ئەوانەی خۆر و مانگی دەپەرستن یان ئەوانەی دار و بەردی دەپەرست یان ئەوانەی جنۆکە و شەیتانی دەپەرستی هیچ جیاوازیەکی خستە نێوان, ئەی محمد(ﷺ) کوشتاری بکە لەگەڵ ئەوانەی داری دەپەرستن بەڵام ئەوانەی پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) دەپەرستن کوشتاریان لەگەڵ مەکە ئەوانەی کەوا فریشتە و پیاوچاکان دەپەرستن کوشتار و شەڕ و جەنگیان لەگەڵ مەکە و پێیان مەڵێ موشریك و کافر بەڵکو ئەوانەی جنۆکە و شەیتانی دەپەرستن بەوان بڵێ موشریك و کافر, نەخێر لە وەڵامدا ئەو پرسیارە وەڵامی ئەوەیە کە خوای گەورە هیچ جیاوازیەکی نەخستە نێوانیان بەوەی کە ئەوان جیاوازن لە پەرستراوەکانیانداو چ ئەوەی پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) بپەرستێ چ فریشتەکان بپەرستێ چ پیاوچاکان بپەرستێ چ جنۆکە و شەیتان بپەرستێ چ ڕێباز و بەرنامەیەکی دەستکرد بپەرستێ چ شەخس و کەسێك بپەرستێ چ هەواو نەفس بپەرستێ بکاتە شەریك لەگەڵ خوای پەروەردگار چ هەر کەس و شتێکی بپەرستێ باش بی یان خراپ بی دار بی یان بەرد بەگیان بی یان بێگیان بی وشك بی یان تەڕ بی هەر هەمووی حیسابی ئەوەی بۆ دەکرێ موشریکە کافرە بێبڕوایە خوێنی حەڵاڵە پارێزراو نیە شەڕ و کوشتار و جەنگی لەگەڵ دەکرێ, خوای گەورە بە عام و گشتی فەرمووی ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً﴾ (التوبة آية: ٣٦)

واتە:هەر هەموو موشریك و کافرەکان کوشتاریان لەگەڵ بکەن هەر وەکو ئەوانیش کوشتار لەگەڵ هەمووتان دەکەن, ئەوە کەواتە ئەوە عام و گشتیە. کەواتە نەتیجەکەی ئەو قاعیدە و بنەمایەی چیە ئەوەیە کەوا بێبڕوا و هاوبەش پەیداکاران هەر جۆرە پەرستراوێك بپەرستن بێجگە لە خوای پەروەردگار ئەوە مادام تازە نەبووبێتە موسوڵمان وە یان حوججەشی لەسەر کرابێ ئەوە ئەو کاتی دەبێ لەسەر ئەو کارەی پێی دەگوترێ موشریك و هاوبەش پەیداکار پێی دەگوترێ کافر

وە خوێنی حەڵاڵە وە كوشتاری لەگەڵ دەكرێ وە خوێنی پارێزراو نیە بە موسوڵمان و بڕوادار ناوی نابردرێ, وەكو ئەوەی ئێستا خۆمان هەڵخەڵاتاندووە لە سەردەمی ئێمە كەسێك كەوا دەگوترێ وەڵا كاكە چۆن پێی بڵێم بێبڕوا چۆن پێی بڵێم كافر ئەوە زۆر گەورەیە لەبەر ئەوەی كەسەكە ئەمن گوێم لێ بوو سەڵاواتی لەسەر پێغەمبەری(ﷺ) لێدەدا كەسەكە دەیگوت خوا هەیە, پەنا بە خوای كو دەبی بەوەی بڵێین كافر كو دەبی پێی بڵێین بێبڕوا, كەسەكە نوێژی دەكرد سوننەتی چێشتەنگاوی دەكرد كەسەكە پرسیاری لە من كرد دەربارەی نوێژی سوننەت چەند ڕكاعەتە وتری شەوان كوە و چۆنە, ئا ئەوانە هیچیان لە لای ئەهای سوننە و جەماعە نابێتە بەڵگەی ئەوەی ئەو كەسەی ئەو پرسیارەی دەكا ئاوا دەكا و ئاوا دەڵێ پێی بگوترێ موسوڵمان بڕوادار مادام شیرك و هاوبەشی گەورە یان كوفری هەبێ یان هەڵوەشێنەرەوەك لە هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلام و بڕوای لێ هاتبێتە جێ ئەوانە بە ئیجماع گوتراوە لە لای ئەهلی سوننە و جەماعە, وە جیاوازی و فەرق ناخسترێتە نێوانیان, موسوڵمان لەگەڵیان ڕوبەڕوو دەبێتەوە جا خوێنیان حەڵاڵ دەبێ و وە لە پاشانەكە پارێزراو نابێ بەو بیانووەی كە بڵێن ئەگەر وابی زۆرینەی خەڵكی لەنێو موسوڵماناندا بە بڕوادار و موسوڵمان حیساب دەبێ نەك زۆرینەیان بە كافر و موشریك حیساب بێ پەنا بە خوای كە بت و سەنەمی جۆراو جۆر داتاشراوە و لەو سەردەمەی دەپەرسترێن دەبی زۆر هۆشیار و ئاگاداربین.

وە لەپاشان هەڵوەستە لەسەر ئەوەش دەكەین كە ئەو فەرموودەی ئەو صەحابیە بەڕێزە گێڕایەوە بۆمان كە (ئەبو واقیدی لەیثی)(رضي الله عنه)كەفەرمووی لەگەڵ پێغەمبەری (ﷺ)دەرچووین بۆ (حونەین) كە شوێنێكە لە نێوان (تائیف) و (مەككە), لەوێدا كە ئەو دەفەرمووێ بە پێغەمبەرمان(ﷺ) گوت چۆن موشریك و كافرەكان دارێكیان هەبووە و چەكەكانیان پێوە هەڵدەواسی بە ئومێدی ئەوەی كەوا بەرەكەتداربن و لە شەڕ و جەنگەكانیان سەركەون تۆش دارێكی بۆ ئێمە دابنێ ئێمەش چەكەكانمان پێ هەڵبواسین, جا ئەو قسەیان كەوا كردچاولێكەری بۆ كافرەكان, پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی ((قُلْتُم وَالَّذي نَفْسي بيَده كَمَا قَالَ قَوْمُ مُوسَى (اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ)(سورة الاعراف :آية ١٣٨)إنَّها السُّنَنُ لَتَرْكَبُنَّ سُنَنَ يان سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ))بە هەردووكی دەخوێندرێتەوە فەرمووی ئەوە ڕێگا و ڕێبازی ئەوانە, ئێوە بەدڵنیایەوە ئەگەر وابكەن شوێنی ڕێگا و ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان دەكەون وەكو جولەكە

و دیانەکان پەنا بە خوای, کەواتە دەبی هۆشیار و ئاگادار بین لێرەدا هەڵوەستەی ئەوەی لەسەر دەکەین خەڵکەك دەیکاتە بیانوو بۆ ئەوەی دەڵێ بیانووی نەفامی هەیە بۆ ئەوەی کە شیرکی گەورە و کوفری گەورەش کەسەکە کردی پێ نابێتە موشریك و پێ نابێتە کافر هەتا حوججەی تەواوی لەسەر نەکرێ هیچ مەرجێکیان بۆ دانەنایە و بەگشتی وا دەڵێن,ئێمە دەڵێین عوزری شەرعی عوزر بۆ ئەوەی کەوا عوزر بە جەهل وە بیانووی نەفامی ئایا هەیە یان نا ئیختیلاف و جیاوازی کەوتیتە نێوان زانایان لەسەردەمی سەلەفەوە دەتوانین بڵێین هەتاکو دەگاتەوە سەر (ئیبن تیمیە)ی(رحمه الله)و لە پاشەویش و هەتاکو سەردەمی (محمدی کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله) دەتوانین بڵێین جیاوازیەکی ئەوتۆ نیە هەموو ڕوونکردنەوەکان لەسەر ئەوەیە لە دین زەروراتە وە ئاشکرایە وە شیرکی گەورە وە کوفری گەورە هەرکەسێك بیکە ئەو کەسە پێ دەبێتە موشریك پێ دەبیتە کافر ئەگەر نەشیزانیبێ بیانووی نەزانین ناخوا وە گوێی لێ ڕاناگیرێت, لەبەر ئەوەی ئەوە ڕوونکرایتەوە لە قورئانی پیرۆز وە لە سوننەتەکانی پێغەمبەری دڵسۆز(ﷺ) کەسەکە بیانووی بۆ نەماوەتەوە تەنها ئەوە دەمینێتن ئایا ئەگەر کەسەکە تازە بوویتە موسوڵمان نزیك بێت لەوەی کەوا پێشتر کافر بووە ئەوا ئەوکاتی پێیناگوترێ ئەهلی تەوحید و موسوڵمان و بڕواداری تەواو تاوەکو حوججەی لەسەر دەکرێ, ئەوجە لەپاش حوججەی ئەگەر وازی هێنا لە شیرك و کوفرەکەی بڕوادارە موسوڵمانە موحیدە, ئەگەر وازی نەینا و پێداگیری کرد بەدڵنیایەوە ئەوکاتە موشریکە کافرە ئەوکاتی خوێنی حەڵاڵە و پارێزراو نیە, جا یان کەسێك لە دوورە وڵات و جێیەکی ژیابی کە زاناو زانستی عەقیدە و بیروبڕوای شەرعی لەلا دەست نەکەوتبی ئەویش هەر حیساب ئەوەی بۆ دەکرێ, بێجگە لەوانەش کەوا ئیکڕاهیان لەسەرە و مەرجەکانی ئیکراهی هاتبێتە جێ کە بەناچاری کوفر و شیرکەکەی بڵێن بە مەرجە شەرعیەکانی ئیکڕاهی ئەوانیش لەسەریان حیساب نیە ئەگەر نا ئەوی ماوەتەوە ئەوانی تر ئەوکاتەی کەوا شیرك و کوفری ئاشکرا و گەورە دەکەن عوزر بە جەهلیان بۆ نیە ئەوە ڕای پەسەند و شەرعیە ئەو فەرموودەش کە دەکرێتە بەڵگەی ئەوەی هەر ئەوەی تێدایە لەسەر وەی هاتیتەوە و زانایان دەیکەنە بەڵگە کە دەڵێن ئێمە نزیك بووین لە کوفر تازە ببووینە موسوڵمان .

## وانەی دوازدەیەم

پرسیار و وەڵامەکانی بنەمای سێیەم بۆمان نەگوتبوو دەیلێین و ئەوجا دەچینە سەر شەرح و ڕاڤەی بنەمای چوارەم بە پشتیوانی خوای گەورە, ئەو پرسیارانەی هەڵمانهێنجاوە و دەرمان هێناوە لە بنەمای سێیەم ئەوانەن:—

## پرسیار و وەڵامەکان

یەکەم: خەڵکی و مەردووم لە جۆراوجۆری پەرستراوەکان چۆن بوون ؟

وەڵام: پەرستراوی جۆراوجۆریان دەپەرست, هەبووە لە پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام)ی پەرستووە هەبووە فریشتە هەبووە پیاوچاکان هەبووە جنۆکە و شەیتانی پەرستووە هەبووە دار و بەردی پەرستووە هەبووە خۆر و مانگی پەرستووە هەتا دوایی پەرستراوەکانیان جۆراوجۆر بووە .

دووەم: بەڵگەکان لەسەر جۆراوجۆری پەرستراوەکانیان لە قورئانی پیرۆز بێنەوە ؟

وەڵام: یەکەم پەرستنی فریشتە و پێغەمبەران (ﷺ)خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿وَلا يَأْمُرَكُمْ أَنْ تَتَّخِذُوا الْمَلائِكَةَ وَالنَّبِيِّينَ أَرْبَاباً﴾(آل عمران آية: ٨٠).

واتە:خوای گەورە ئەرك و فەرمانی پێ نەداون کەوا فریشتەکان و پێغەمبەران (ﷺ)بە پەرستراو بزانن بێجگە لە خوای پەروەردگار یان بیانکەنە شیرك و هاوبەش لەگەڵ خودا, یان دەفەرمووێ خوای پەروەردگار دەربارەی پێغەمبەر عیسا کە دەفەرمووێ ﴿وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنْتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَهَيْنِ مِنْ دُونِ اللَّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِنْ كُنْتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ﴾(المائدة آية: ١١٦).

واتە:خوای پەروەردگار دەفەرمووێ لەوکاتەی کە خودا بە عیسای دەڵێ و دەفەرمووێ ئەی عیسای کوڕی مەریەم ئایا تۆ بە خەڵکت گوتووە من و دایکم بە دوو پەرستراو بگرن بێجگە لە خوای بمان پەرستن, عیساش لە وڵامدا فەرمووی پاکی و بێگەردی بۆ تۆ خوای پەروەردگار لە قسە و شتێکی کە بۆمن حەق و ڕەوا نیە بۆم بیکەم وە وانیە, ئەگەر واشم گوتبا تۆ عیلم و

زانستیت پیێ هەبوو ئەی خوای پەروەردگار تۆ ئەوەی لە ناخ و دڵی منە دەیزانی جا تۆ ئەوەی لە ناخ و دڵمەوەیە دەزانی لە نەفسمەوەیە دەزانی جا من لەوانە نازانم كە لە نەفسی تۆیە, بە ڕاستی خوایە تۆ زۆر زانای بە شتە نادیارەكان, جا لەو ئایەتەی بەڵگەی ئەوەش دەست دەكەوێت كە ئەهلی سوننە و جەماعەی دەفەرموون خوای پەروەردگار خاوەنی نەفسە نەفسێك كە بۆی دەوەشێتەوە بیێ ئەوەی ئێمە چۆنیەتەكەی ئێمە بزانین .

لەپاشان بەڵگە لەسەر پەرستنی پیاوچاكان خوای پەروەردگار دەفەرمووێ ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ﴾ (الإسراء آية: ٥٧).

وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی كە دار و بەردیان پەرستیە ﴿أَفَرَأَيْتُمُ اللاتَ وَالْعُزَّى * وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الأُخْرَى﴾(النجم آية: ١٩–٢٠) وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی داریان پەرستیە ئەوە حەدیسەی پێغەمبەریشە (ﷺ)كە (باوكی واقیدی لەیثي)(رضي الله عنه)كە دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ لەگەڵ پێغەمبەری (ﷺ)چووین بەرەو (حونەین) كە شوێنێكە دەكەوێتە نێوان (تائیف) و (مەككە) دەڵێ ئێمە تازە نویێ بووین بە كوفر واتا لەمێژ نەبووبوو ببووینە موسوڵمان, وە موشریك و هاوبەش پەیداكاران دار ودرەختێكیان هەبوو كە لەلای دەمانەوە و چەكەكانیان پیێ هەڵدەواسی پێی دەگوترا (ذات أنواط) واتا خاوەن نیشانە و خەڵات, ئێمەش بەلای دارێكی وا دارۆیشتین كە گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)بۆ ئێمەش (ذات أنواط) یێك دابنیێ نیشان بكە تاوەكو ئێمە چەكەكانمان پێوە بكەین, دەڵیێ پێغەمبەر (ﷺ)لەوەڵامدا سەرزەنشتی كردن كە لە دواتر دەقی فەرموودەكەی دەینینەوە لە وەڵامی پرسیارێكی تر لەبەر ئەوە ئێمە ئێستا ئەوەندەی لەسەر نارۆین, كەواتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی موشریك و هاوبەش پەیداكاران جار وەبوو پیت وبەرەكەتیان لە داری وەردەگرت یان دەیان پەرستن.

وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی كە خۆر و مانگ پەرستراوە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾(فصلت آية: ٣٧).

واتە:لەبەڵگە و نیشانەكانی خوای پەروەردگار شەو و ڕۆژە و مانگ و خۆرە ئێوە كڕنۆش مەبەن بۆ مانگ و خۆر بەڵكو كڕنۆش بەرن بۆ خوای كە ئەوانی بەدیهێناوە ئەگەر ئێوە دەتانەویێ تەنها

خوای بپەرستن پەرستشی بۆ ئەنجام بدەن, کەواتە دیارە سوژدەیان دەبرد موشريك و هاوبەش پەيداکاران بۆ خۆر و مانگ لەبەر ئەوە خوای گەورە وای فەرموو .

سێيەم: ئايا جياوازی پەرستراوەکان هيچ جياوازيەك پەيدا دەکات بۆ حوکم دان لەسەر ئەوانەی کە دەيان پەرستن ؟

وەڵام: نەخێر هەموويان هەر هاوبەش برِياردەر و موشريك ناوبراون و خوێنيان نەپارێزراوە و خوێنيان بۆ پێغەمبەر(ﷺ)و موسوڵمانان حەڵاڵ بووە, وەکو خوای پەروەردگار لە قورئانی پيرۆزدا فەرموويەتی ئەوانەی شيرك و هاوبەشی پەيدادەکەن بيانکوژن و کوشتاريان لەگەڵ بکەن, جياوازی نەخستە نێوانيان دەفەرمووێ کە موشريك گوتمان ئەوەی هەر پەرستراوێکی بپەرستێ لەگەڵ خوای پەروەردگار بە موشريك حيسابە, کەواتە ئەو ئايەتە دەيگرێتەوە خوای گەورە هەر بە موشريك ناوی بردينە و ئەوەی هەر پەرستراوێکی بپەرستی هەر بە موشريك ناودەبردرێ خوای گەورە هيچيانی لێ هەڵنەهێنجاوە وە دەفەرمووێ هەر هەموويان کوشتاريان لەگەڵ بکەن ئەوانەی کەوا موشريك و هاوبەش پەيداکارن, خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً﴾ (التوبة آية: ٣٦) واتە: وە ئەوانەی شيرك و هاوبەشيان پەيداکرد شەڕ وکوشتاريان لەگەڵ بکەن.

لە پاشان دێينە سەر ئەوەی فەرموودەکەی (باوکی واقيدی لەيثي)(رضي الله عنه)بينينەوە ئەوە پرسيارەکەيە وە چەند پەند و وانەيەکی لێدەربينين (باوکی واقيدی لەيثي)لە وەڵامدا دەڵێين گوتی لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەرچووين بەرەو (حونەين) کە شوێنێکە دەکەوێتە نێوان (تائيف) و (مەککە) ی ئێمە نزيك و نوێ بووين بەسەردەمی کوفرەوە واتا تازەبووين لە بڕوا هێنان و موسوڵمانەتيمان, هاوبەش برِياردەران دار و درەختێکيان هەبوو لەلای دەمانەوە و چەکەکانيان پێ هەڵدەواسی پێی دەگوترا(ذات أنواط) واتا خاوەن نيشانە و خەڵات ڕۆيشتين بەلای دارێکی (تاوگ,تايلە) واتا (نەبەق) وتمان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)بۆ ئێمەش خاوەن نيشانە و خەڵات دابنێ هەروەکو ئەوان (ذات أنواط) يان هەيە پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی ((قُلْتُم وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِه كَمَا قَالَتْ بَنو إِسْرَائِيلَ لِمُوسى(عليه السلام)(اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ )(سورة الاعراف :آية ١٣٨))) واتا ئێوە قسەيەکتان کرد سوێند بەو

زاتەی کەنەفس وگیانی منی بەدەستە پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی کە بەنو ئیسرائیل بە موسای پێغەمبەریان گوت تۆ پەرستراوێك بۆ ئێمە دابنێ هەروەکو ئەوانەی موشریك و هاوبەش پەیداکارن پەرستراویان هەیە, موساش پێ گوتن ئێوە گەلێکی نەزان و نەفامن ،

ئەوجا پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی ((لَتَرْكَبُنَّ سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ))ئێوە دەڕۆن بەڕێ و شوێنی ڕێبازی ئەوانەی لەپێش ئێوە هاتوون لە جولەکە و دیان و کافرەکان. (سنن ترمزي ٢١٨١) (ئیمام ئەحمەد ٥/ ٢١٨) پەند و وانەکانی لەو فەرموودەی وەردەگیرێ :–

یەکەم: ئەوەیە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)خوا لێیان ڕازی بێت بەرەو جەنگ و جیهاد دەڕۆیشتن, کە جەنگ و جیهادیش لوتکەی بەرزی ئیسلامە و عیبادەت و پەرستشێکی چاك و لەجێیە بەڵام ئەوەی دەبێتە مایەی هاوبەشی و هاوبەش دانانە وەرناگیرێت هەرکەسێك کە بەرەو هەر عیبادەت و پەرستشێکی بچێ یان بیەوێ هەر پلە و پایەکی بەدەست بێنێ ئەگەر جەنگ و جیهادیش بێت ڕەت دەکرێتەوە بە سەریدا.

دووەم: هەندێ لە هاوەڵان ئەو پرسیارەیان کرد کە تازە بووبوونە موسوڵمان نزیك بوون لە سەردەمی کوفر, ئەگەر نا هاوەڵان زانایەکان و ئەوانەی تر کە لەمێژبوو بووبوونە موسوڵمان وایان نەگوتووە .

سێیەم: ئەوەی لێ وەردەگیرێ دوو ڕا هەیە لەسەر کاتی موسوڵمانبوونی (باوکی واقیدی لەیثي) ڕاو بۆچوونی یەکەم دەڵێ لە جەنکی بەدر موسوڵمان بووە و جەنگی (بەدر)ی بینیوە کۆمەڵێك لە زانایان وایان گوتووە لەوانە (صەنعانی) ئەو ڕایەی پێ پەسەندە, ڕای دووەم کە پەسەنترە و صەحیحترە لە هی یەکەم دەڵێن پێش ڕزگارکردنی (مەککە) موسوڵمان بووە یان لەگەڵ ڕزگارکردنی (مەککە) موسوڵمان بووە زۆرینەی زانایان ئەوە ڕایانە و ئەوەش ڕاستترو پەسەندترە (والله أعلم) .

چوارەم: ئەو فەرموودەیە نابێتە بەڵگە بۆ ئەوەی (عذر بە جهل) بیانووی نەفامی و نەزانی دەبێتە عوزر و بیانوو بۆ کافر نەکردنی ئەوەی بە نەزانین شیرك و کوفری گەورە بکە تاوەکو حوججەی لەسەر دەکرێ, چونکە لە دەقی قسەکانی داهاتووە (باوکی واقیدی لەیثي) دەڵێ ((وَنَحْنُ حُدَثَاءُ عَهْدٍ بِكُفْرٍ))ئێمە نزیك و نوێ بووین بەکات و سەردەمی کوفرەوە, جا زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەوەی شیرك و کوفری گەورە و ئاشکرا

بکات تازە بووبووێتە موسوڵمان تاکو دوای بیانوو و بڕینی نەزانین و حوججە لەسەر کردنی پێی ناگوترێ کافر و خوێنی حەڵاڵ ناکرێ, بەڵام کە حوججەی لەسەر کرا بیانووی بڕا لەپاشتر پێی دەگوترێ کافر و بێبڕوا وە خوێنیشی حەڕام نامینێتەوە وە بەفیڕۆ دەچێ و لە پاشانەکە لەکاتی ئەو شیرك و هاوبەشییەی ئەگەر حوججەشی لەسەر نەکرابی هەر پێی ناگوترێ موسوڵمان و موحید و خوا بەیەکگر, بەڵکو ناوی دەبردرێ بە موشریك.

وە وەڵامێکی تر ئەوەیە کە هاوەڵەکان ئەوەی گوتیان وەسیلە و ئامرازی شیرك بووە لەلای هەندێك لە زانایان بەڵکو هاوبەشی و شیرك نەبووە خودی هاوبەشی و شیرکەکەی نەگرتۆتەوە تەنها پرسیاریان دەربارەی کردوو و ئەنجامیان نەدا و نەیان کرد و بڕوایان وانەبوو, پێغەمبەریش (ﷺ)لەسەر پرسیارەکەیان سەرزەنشتی کردن و وە قەدەغەی کردن ئەوانیش وازیان هێنا لە پرسیارەکەیان و پەشیمان بوونەوە و ئەنجامیان نەدا .

جا ئەوەندەمان دەرهێنابوو لە پرسیار و وەڵامەکانی بنەمای سێیەم , جا دەچینە سەر شەرح و ڕاڤەی بنەمای چوارەم.

## بنەمای چوارەم

الْقاعدَة الرّابعَة: أَنَّ مُشْرِكي زَماننا أَغْلَظُ شِرْكاً منَ الْأَوّلين، لأَنّ الْأَوّلينَ يُشْرِكُونَ في الرَّخاءِ وَيُخْلِصُونَ في الشِّدَة، وَمُشْرِكُو زَماننا شِرْكُهُم دائماً في الرَّخاءِ وَالشّدَة.
وَالدّليلُ قَوْلُه تَعالى: {فَإذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذا هُمْ يُشْرِكُونَ}(العنكبوت آية: ٦٥).

دەفەرمووێ ﴿أن مشركي زماننا أغلظ شركا من الأولين، لأن الأولين يشركون في الرخاء ويخلصون في الشدة، ومشركوا زماننا شركهم دائما في الرخاء والشدة﴾ دەفەرمووێ هاوبەش پەیداکارانی سەردەمی ئێمە تونتر و خراپترن لە شیرك و هاوبەشی لە هاوبەش پەیداکارانی پێشین و سەرەتای سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ), چونکە بەڕاستی ئەوانەی پێشین و سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)شیرك و هاوبەشیان دەکرد لەکاتی شێنەیی و فرە ژیانی و ژیان خۆشی بەلاّم یەکلادەبوونەوە بۆ خوای و تەنها هاواری خوایان دەکرد و ئیخلاصیان دەبوو وازیان دەینا لە شیرك و هاوبەشی لەکاتی تەنگەشە و ناخۆشی و زەحمەتی, بەلاّم موشریك و هاوبەش پەیداکارانی سەردەمی ئێمە شیرك و هاوبەشیەکەیان بەردەوامە لەکاتی شێنەیی و خۆشی وە لەکاتی توندی و ناخۆشی و تەنگەشەیی,﴿والدليل قوله تعالى﴾وە بەڵگەش لەسەری ئەوەیە خوای بەرز فەرموویەتی ﴿فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ﴾ (العنكبوت آية: ٦٥).

واتە:خوای پەروەردگار دەفەرمووێ ئەگەر سواری کەشتی بووبان هاواری خوایان دەکرد کاتێك شەپۆل لێی دەدان یکلادەبوونەوە بۆ خوای شیرك و هاوبەشیان ئەنجام نەدەدا کە ڕزگارمان دەکردن و دەچوونە وشکانی دەستیان دەکردەوە بە شیرك و هاوبەشی.

بەلاّم موشریکەکانی سەردەمی ئێمە ئەگەر ئێمەش سەرنجیان بدەین لەکاتی ناخۆشی و تەنگەشەکانیش هانا و هاوار دەبەن پەنا بە خوای بۆ مردووەکان بۆ گۆرەکان بۆ شێخەکان بۆ جنۆکە و شەیتان هانا و هاوار نابەن بۆ خوای پەروەردگار, هەر دەڵێن غەوسەکەی ماڵ لە

بەغدای لە هانامان وەرە پیرە فلان لە هانامان وەرە ئەی فلانە مەرقەد ئەوەم لەسەر بێ ئەگەر ڕزگارم بكەی پەنا بە خوای ئەوانە هەموو شیرك و هاوبەشیە بۆ خوای پەروەردگار و قەبوڵ نیە, جا لێرەدا دەگەینە سەر ئەوەی كە خوای گەورە دەفەرمووێ ئەمن ئەو كردەوانەی كە شیرك و هاوبەشی تێدابی قەبوڵم نیە و ڕەتكراوەیە بەسەر خاوەنەكانیان, دەفەرمووێ لە فەرموودەیەكی قودسی كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی خوای گەورە دەفەرمووێ ((أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ))(مسلیم ٢٩٨٥) ئەبو هورەیرە(رضي الله عنه) ڕیوایەتی كردیە دەفەرمووێ (من دەوڵەمەندم لە شیرك و هاوبەشی كە بۆم ئەنجام بدرێ هەر یەك كار و كردەوەیەكی كرد جگە لەمنی كردە شەریك و هاوبەشی لەگەڵ من كار و كردەوەیەكەی و شیركەكەی و هەمووی وەلا دەنێم و ڕەتدەكەمەوە و نامەوێ و لێی وەرناگرم).
جا دەبێ ئاگەدار بین ئەگەر شیرك وهاوبەشی بكەین عیبادەت و پەرستشەكانمان قەبوڵ نابێتن جا خراپی ئەوانەی كە لەسەردەمی خۆی شیرك و هاوبەشیان لەسەردەمی (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله)دەكرد دەتوانین بلێین لە دوو خاڵیدا توندتر و خراپترن, ئەوانی سەردەمی ئێمەش لەگەڵ هی بەراورد بە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ).
خاڵی یەكەم لەكاتی خۆشی و ناخۆشیدا ئەوانە شیركی دەكەن هی سەردەمەكانی ئێمە و سەردەمی (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله), ئەوان تەنها لەكاتی خۆشیەكاندا شیركیان دەكرد لەكاتی ناخۆشیدا نەیان دەكرد وە خاڵی دووەم ئەوانەی دەیان پەرستن و دەیانكەنە شەریك و هاوبەش لەسەردەمی (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب) و سەردەمی ئێمەش بەڕاستی خەڵكە خراپەكانن زیناكارەكانن تاوانبارەكانن شەیتان و جنۆكە شەیتانیەكانن بەڵام ئەوانەی لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)دەكرانە شەریك و هاوبەش هەرچەندە ئەوە بیانوو نیە هەردووكیان هەر بەشیرك لە قەڵەم دەدرێن وە خاوەنەكانیان هەر موشریكن بەڵام لەگەڵ ئەوەی دا پەرستراوەكانی ئەوان پیاوچاكەكان بوون یان پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)بوون یان فریشتەكان بوون لەبەر هەندێ شیرك و هاوبەشی سەردەمی (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله) و سەردەمی ئێمە توند و تیژتر و خراپترە لەهی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ).
جا لەو بنەمایەی كەواتە تێگەیشتین ئەوە وەردەگیرێ هاوبەشی مەزن و ئاشكرا ئەگەر هەركەسێك بیكات مەگەر بە ناچاری و مەرجەكانی ناچاری و ئیكراهی لێ بێتەجێ یان تازە

هاتبێتە ناو ئیسلام و یان کەسی زانا و زانستی عەقیدە و بیروبڕوای دەست نەکەوتبێت و دوورە وڵات ودوورە دەست بووبێت لەوشتانە ئەوانە بیانوون بۆ ئەوەی هەتا حوججەی لەسەر نەکرێ پێی ناگوترێ کافر و ئەگەر پێشی بگوترێ موشریك وە پێشی نەگوترێ موحید و خوا بەیەکگر وە خوێنی حەڵاڵ نابێ, بەڵام جگە لەوانەی ئەو بیانووەیان هەیە هەکەسێك شیرك و هاوبەشی گەورە و مەزن یان کوفری گەورە و مەزن و ئاشکرا بکا ئا ئەو کەسە پێی دەگوترێ موشریك و کافر بیانووی نەفامی و نەزانینی لێ وەرناگیرێت و وە عیبادەت و پەرستشەکان بەسەریدا ڕەت دەکرێتەوە جا ئەگەر حەجیش بکا عومرەش بکا نوێژیش بکا زەکاتیش بدا وە لەپاشانیش هەموو قورئانی لەبەر بی هەر کارێکی خێر و چاکەی تر بکا چونکە شیرك و هاوبەشی کار و خێرە چاکەکان و عیبادەتەکان هەڵدەوەشێنێتەوە, جا لە کۆتاییەکەیدا پرسیار و وەڵامەکانی بنەمای چوارەم دەخەینە ڕوو تەنها دوو پرسیارە .

## پرسیار و وەڵامەكان

**یەكەم:** هاوبەشی پەیداكارانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)لەگەڵ سەردەمی (محمدی كوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله) و سەردەمی ئێمە جیاوازیان چیە وە كامەیان خراپتر و توندترە ؟

**وەڵام:** هی سەردەمی (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله)و سەردەمی ئێمە خراپتر و توندترە لە هی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ),لەبەر ئەوەی ئەوانەی سەردەمی پێشان و سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)لەكاتی شێنەیی و ژیان خۆشی و فرەوانی هاوبەشیان ئەنجام دەدا بەڵام لەكاتی ناخۆشی و تەنگەشەیی یەكلادەبوونەوە بۆ خوای پەروەردگار و شیرك و هاوبەشیان ئەنجام نەدەدا, بەڵام هی سەردەمی ئێمە و سەردەمی (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله)لەهەردوو كاتەكان لە خۆشی و ناخۆشی شەريك بڕیاردەدەن و شیركی دەكەن, بەڵگەش لەسەری ئەوەیە كە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ ﴿فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ﴾ (العنكبوت آية: ٦٥). یان خوای پەروەردگار دەفەرمووێ ﴿وَإِذَا غَشِيَهُمْ مَوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ فَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ﴾(لقمان آية: ٣٢).ئەوانەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی كەوا كافر و موشریكەكانی كۆن لەكاتی فەرەحناهی و خۆشی دا شیرك و هاوبەشیان دەكرد وە لەكاتی توندی و ناخۆشی و تەنگەشەیی دا ڕوویان دەكردە خوای و وازیان دەهینا لە شیرك و هاوبەشی،

وە ئەو پەرستراوانەی دەپەرستراشن لەسەردەمی (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله) و سەردەمی ئێمەش خراپترن لەو پەرستراوانەی كە دەپەرستران لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)چونكە هی سەردەمی پێغەمبەری (ﷺ)یان پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)بووە یان فریشتەكان بووە یان پیاوچاكان بووە بەڵام هی سەردەمی (شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله)و سەردەمی ئێمە ئینسان و مرۆڤە دز و خراپ و زیناكار و خوێنڕێژ و بەدڕەوشت و تەنانەت موشریك و كافر و جنۆكەی شەیتانی و شەیتان دەپەرسترێن كە ئەوەشیان خاڵێكی ترە

لەوەی کەوا نیشان دەدا موشریك و هاوبەش پەیداکارانی سەردەمی (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) (رحمه الله)و سەردەمی ئێمە خراپتر و توندترن لە هی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ).

دووەم: ئەوەی هاوبەش لەگەڵ پەرستش بکات ئایا پەرستنەکانی لێ وەردەگیرێ یان نا ؟

وەڵام: هاوبەش پەرستش و عیبادەتەکان بەتاڵ دەکاتەوە و خاوەنەکەی دەست بەتاڵ دەمێنێتەوە ئەگەر نوێژ بکات و ڕۆژیش بگرێت و حەجیش بکات و عومرەش بکات تەنانەت هەموو قورئانیشی لەبەر بێ ئەوە بەدڵنیایەوە موسوڵمان نیە و بڕوادار نیە و لێی وەرناگیرێت و بەسەریدا ڕەت دەکریتەوە, کە لە بار و زروفەکانی ئەمڕۆی ئێستای ئێمەدا

پەنا بە خوای گەورە جاروایە پشتگیری کردنی کافر و موشریکەکان ئیسلامەتیت لێ هەڵدەوەشێنێتەوە وە هەر کار و عیبادەتەکی تر بکەی ئەوە ئەوکاتی لێت وەرناگیرێت و بەسەرت دادەدرێتەوە.

با لێی هۆشیار و ئاگاداربین ئەو بنەمایانە لێی تێ بگەین لە شیرك و هاوبەشی خۆمان دووربخەینەوە خۆمان بکەینە خاوەنی خوا بەیەککگرتن و تەوحید بەڵکو خوای پەروەردگار لەسەر ئیسلام و بڕوا بمان ژیێنی وە لەسەر ئەوەی بمان مرێنی وە لەسەر بیروبڕوایەکی کە بەخۆی پێ ڕازیە زیندوومان بکاتەوە .

وصلَّ اللهُ وَسَلَّمَ عَلَىَ نَبِيّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَىَ آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين

